# ئـــــايديـــاى قـــانـــوون

## دينيس لـــويـد

وەرگێڕانی

ئاسۆ کەریم نەریمان تاڵب

محەمەد مشیر

کوردستان – هەولێر

٢٠٠٦



**ناوی کتێب: ئایدیای قانوون**

- نووسینی: دینیس لوید

– وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئاسۆ کەریم – نەریمان تاڵب – محەمەد مشیر

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی

– بەرگ: سەیوان

– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– ژمارەی سپاردن: ٢٣٨

– تیراژ: ٥٠٠ دانە

– چاپی یەکەم ٢٠٠٦

– نرخ: ٢٠٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب –٦٣– (١٦٦)

ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن : 2260311

www.mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## روونکردنەوەیە

بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە (ئایدیای قانوون) لە عەرەبییەوە کراوە بەکوردی.

بەم شێوەیە:

لەلاپەڕە (٧-٥٢) لەلایەن ئاسۆ کەریم.

لەلاپەڕە (٥٣-١٢٥) لەلایەن محەمەد مشیر.

لەلاپەڕە (١٢٦-١٦٠) لەلایەن نەریمان ناڵبەوە. وەرگێڕدراوە

# داخوا قانوون پێویسته؟

رەنگە لە دەسپێکی ئەم باسەماندا، هێنانەگۆڕێی ئەم پرسیارە لەمەڕ ئایدیای قانوون، کە داخوا بەڕاست قانوون پێویستە، یان نا سەرسوڕهێن بێت.

وەلێ، راستییەکەی، ئەم پرسیارە گرنگییەکی مەزنی هەس. ناکرێ و نابێ ئێمە بە پرسێکی بەڵگەنەویستی دانێین، لێ نیگەرانی لە شك و گومانەوە، سەرچاوە دەگرێ. سەرسوڕهێنیش تەنێ لەوەدا نییە کە داخوا دەکرێ دەسبەرداری قانوون ببینین؟ یان داخوا قانوون بۆ هێنانەئارای کۆمەڵێکی دادپەروەر، پێویستە یان نا؟ بەڵکە لەوانەشە قانوون خۆی لە خۆیدا بەد و نا- پەسندو کۆسپێکی خەتەر بێت لەبەردەم وەدیهاتنی سروشتی کۆمەڵایەتیی مرۆڤدا. هەرچەند ئەم تێڕوانینە لە کن ئەوانەی لە کۆمەڵێکی دیموکراتیی لەبارو تەکووزدا، دەژین سەرسوڕهێن بێتە بەرچاو — کەموکەسری ئەو کۆمەڵەو خەوشەکانی هەر چەندێك بن- لەگەڵ ئەوەشدا بێ مفا نییە لەوە بەئاگابین، بەرکاریی قانوون لە کۆمەڵگەیەکی کەم تەکووزتردا، لەوانەیە رواڵەت و بیچمێکی لەبەردڵان نا شرینی هەبێ. هەروابێتەوە، هەست بەوە کردن کە قانوون هەر لەخۆوە پێویستە، یان بۆ دەبێ بۆ مرۆڤی کۆمەڵێکی تەکووزدا، پێویست بێت، لەلایان زۆرانەوە لە زنجیرەی دوورودرێژی فەیلەسووفە



پێشەنگەکانی رۆژئاواوە، *لە (ئەفلاتوون* Plato، *٤٢٧- ٣٤٧ی پ. ز) ەوە* بگرە تا (*مارکس* Karl Marx ١٨١٨- ١٨٨٣) بەم یان بەو شێوەیە، قانوون رەتکراوەتەوە. هەروا دژایەتیکردنی قانوون لە چەند سیستەمێکی زلی ئایینی لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەورێکی بەرچاوی گێڕاوەو توخمێکی یەکلاکەرەوە بووە لە ئایدیۆلۆجیای "کلێسای مەسیحی" لە قۆناخی ئەفراندن و گوراندا. بێ لە مارکسیزم، تا ئێستەش، لایەنگرانێکی دڵگەرمی دۆکترینی ئانارشیزم وەکو چارەسەرێکی ئاریشە جڤاکی و کەسایەتییەکانی مرۆڤ، لە مەیداندا هەن. لە هەموو سەردەماندا - بە سەردەمی ئێمەشەوە - تاك تاك و دەستەو کۆمەڵەش هەن بەگشتی ڕکیان لە هەموو دەسەڵاتێك دەبێتەوە و بەرسڤ و باوەگۆی ئەم هەستی ڕك لێبوونەوەیە دەدەنەوە لە رێگەی خۆ- بەتاڵکردنەوەوە بە کاروکردەو خۆنیشاندانی دژبە هێزەکانی نیزام و قانوون. بێگومان، ئەم خەڵکانە لە دڵسۆزییان، وەدووی کۆنسێپتێکی لێل و نا ڕوون کەوتوون و پێیانوایە ئەو هێزی خۆنیشاندانە بە رێگەیەکی پەنامەکی، ژیانێکی خاستر بۆ توخمی ئادەمیزاد دێنێتە ئاراوە، وەلێ ئەم وەجۆش وخرۆش کەوتنە، بە گشتی کاریگەرییەکی گەلێ کەمی بەسەر رەوتی سەرەکیی بیرو هۆشی مرۆڤایەتی هەبووە. لەسەرینی ئەمەوە، دەبێ لەو دیو رواڵەتە دەرەکییەکانی پرتەو بۆڵەی کۆمەڵایەتی ورد ببینەوەو هەوڵ بدەین لە بنەمای ئایدیۆلۆجیی بێزاربوون لە ئایدیای قانوون خۆی، بگەین تا بزانین ژ بەر چی ئەو هەموو ژمارە زۆرەی خەڵك کە سەر بە شارستانەتیی جیا-جیان.. لە باری کولتووری و لێکدابڕاویی جوگرافییەوە، بە درێژایی قۆناخگەلی دیرۆکی مرۆڤایەتی، سەرلەبەر قانوون رەت بکەنەوە و لە باشترین گریمانەدا بە شەڕو بەڵایەکی لە چارنەهاتووی دانێن کە تەنیا لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی نوقستان لە هەموو رووێکەوە نەبێ، هەڵناکات.

له جێگەیەکی دی ئەم کتیبەدا، گرنگی بە رۆڵی قانوون وەکو دیاریدەیەکی جڤاکی، هەروابێتەوە بە ئەرکی قانوونیش دراوە، بەو پێیەی بەشێکە لە ئێسك و گۆشتی دیسپلینی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی بە چەمك، یان هزرکردنی کۆمەڵێکی دادپەروەرانەوە هەیە. وەلێ ئێمە لێرانە، لە پێشدا وتووێژ لەسەر ئەم پرسانە ناکەین، بەڵکە جەخت لەسەر ئەو سەمتە فیکرییانە دەکەینەوە کە سۆنگەی رەتکردنەوەی رەهای پێویستبوونی قانوونن لە رەخێك، یان ئەو کۆنسێپتەی کە قانوون بە دەردو بەڵایەك دادەنێ، کە ناکرێ بەری لێ بگیرێ، مەگەر وەکو بیانوێکی کاتی، مادام مرۆڤ حەز دەکا، یان ناشێ کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرانە دابمەزرێنێ لە لایەکی ترەوە.

## سروشتی مرۆڤ

هەرکە دبێژین ئەم کۆنسێپتە، یان چەمکە رواڵەتێکی ئایدیۆلۆجی هەس، مەبەستمان ئەوەیە ئەم چەمکە بەشێك لە پێوەندیی ئێمە بە دنیا و بە کۆمەڵگە بە هەموو رواڵەتە جیا -جیاکانیانەوە، پێکدێنێ. بێ دوودڵی، ئایدیای قانوون، لەم شەقڵە ئایدیۆلۆجییە پشکی خۆی هەیە. لەبەرئەوە دیدی ئێمە بۆ ئایدیای قانوون بێ سێ و دوو، رەنگ و رووی چەمکی گشتیی ئێمە لە مەڕ شوێنی مرۆڤ لە دنیا، لەمەڕ سروشتی مرۆڤ، یان ستاتۆی مرۆڤایەتی هەروەکو هەندێ لە نووسەرە هاوچەرخەکان، پێیان خۆشە وا ناوی بهێنن، وەردەگرێ. هەروا بەو ئارمانج و مەبەستانەی کە دەبێ مرۆڤ بەدیانبهێنێ، یان داوای بەدیهێنانیان بکا. هەرکە پێ لەسەر ئەوە دادەگرین داخوا قانوون بۆ مرۆڤ پێویستە یان نا، تەنیا هەوڵ نادەین فاکتێکی سادەی فیزیکی، لەگوین مرۆڤ ناتوانێ بەبێ نان و ئاو هەڵبکاو بژی، باسبکەین، بەڵکە ئێمە لە بەرانبەر پرۆسەیەکی نرخ بۆ دانان داین. ئەوەی بەڕاست



گەرەکمانە بێژین داخوا سروشتی مرۆڤ لەباریدا هەیە وا بکا بەبارێکی راستەقانیی مرۆڤانە لە مەڕ ئایدیای بوون، یان نەبوونی قانوون، بگات. ئەمەش گریمانەیەکی پەنامەکی دەگرتە خۆ سەبارەت بە ئامانج و مەبەستی مرۆڤ، داخوا چ شتێك خێری بۆ ئەو هەیە، چیش شەڕو دەردو بەڵا، چیش پێویستە تا بەو ئامانجانە، بگات..

بێگومان مژولبوونی چڕوپڕو هەمیشەیی مرۆڤ بەو پرسانە، بیرمەندانی هەموو سەردەم و کۆمەڵگەیەکی، سەبارەت بە سیفەتی مۆراڵی، یان شیمانەیی سروشتی مرۆڤ، خستووەتە ناو پیلەکەیەکی بێکۆتاییەوە. لە رۆژی ئەمڕۆماندا، هەندێك پێیانوایە ئەم پیلەکەیە نەك هەر نابڕێتەوە، بەڵکە بێ ماناشە. بەهەرحاڵ ئاکامی کارەکە هەرچۆن بکەوێتەوە، هەڵویستی وەرگیراو لەم پرسە، پێشەکییەکی مەنتیقییە بۆ ئەو دەرەنجامە کە داخوا قانوون بۆ مرۆڤ پێویستە یان نا؟ هەروا ئەم پێویستبوونەش تا کوێ بڕ دەکا؟ هەر ئەمەش وایکردووە وتووێژ لەمەڕ ئەو پرسە، شیانی نکولێلێکردن نەبێ. بەگوێرەی ئەوانەشەوە کە پێیانوایە مرۆڤ بەرجەستەبوونی دەردو بەڵایە، یان لە باشترین باردا تێکەڵەیەکە لە "پاڵنەر"ی خێر و شەڕ، ئەو دووانەش لە ململانەیەکی بەردەوامدان کە تیایدا سەرکەوتنی شەڕ بەسەر خێردا چەند پات دەبێتەوە. ئەوەی خویایە، پێویستە جڵەوی هێزە خەتەرە رەگداکووتاو و چێندراوەکانی تاریکی لەناو سروشتی مرۆڤدا، بێ ئەملاو ئەولا رابگیرێ، تا نیزامی جڤاکی دانەتەپێ، چونکە بێ ئەو نیزامە، ژیانی مرۆڤ لە ژیانی ئاژەڵان پێشکەوتوتر نابێ. لەم تێڕوانینەوە، ناکرێ دەسبەرداری قانوونێکی جڵەوگر، بۆ کۆنترۆڵکردنی هێزەکانی شەڕ ببین، چونکە بشێوی و نەبوونی قانوون، هەڵەیەکی هەرە گەورەیە و دەبێ خۆ لەو هەڵەیە ببواردرێ. لە لایەکی دییەوە، ئەوانەی پێیانوایە مرۆڤ هەر بەسروشت، خێرخوازە، دەیانەوێ بن و بۆتکەی کەلکەلەو خولیای شەڕ لەناو مرۆڤدا بۆ کاودانی دەرەکی و دەوروبەر بگێڕنەوە. لەسەرینی ئەمەوە ئەوانە وەدوای بوونی خەوشێکی جەوهەری لە ژینگەو دەوروبەری

کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەگەڕێن بەو پێیەی سەرچاوەی ئەو دەردو بەڵایەیە کە مرۆڤ پێیانەوە کەسەردار بووە. هەڵبەت ڕەنگوڕوویێکی هەرە دیاری ئەم دەوروبەرە خۆی لە حکوومەتی دەسەڵاتە حوکمڕانەکان و سیستەمی قانوونیدا دەبینێتەوە کە لەسایەیدا دەسەڵاتی سیاسی خۆی پراکتیزە دەکا. هەرگیز جێی سەرسوڕمان نییە، کە ڕەخنە دەورو خولی ئەم ڕەنگ و ڕووانە بدا بەو پێیەی سەرچاوەی خەفەت ومەینەتیی مرۆڤایەتین.

لە سەردەمی چاکسازیی کۆمەڵایەتیدا، وەکو ئەم سەد ساڵەی دوایی ڕۆژئاوا، وێدەچێ ڕەخنەیەکی لەمجۆرە وای بە باش زانیبێ، تیری خۆی ئاراستەی چاکسازیی قانوونی لە ئارادابوو بکا لە جیاتی ئەوەی داوای هەڵوەشاندنەوەی قانوون بکا، وەلێ دەبێ لەوەش بەئاگا بین کە دەردو بەڵاکانی قانوون، لە کن ڕووناکبیران، لە باری فەلسەفی و ئاینیەوە، چ چارەو دەراوێکیان بۆ نییە، جێگرتنەوەی هەر سیستەمێك بە سیستەمێکی دی کە لەسەر داپلۆسینی شەرعیی دامەزرابێت، هەمان دەردو بەڵاو تۆقاندنی لێدەکەوێتەوە. ئیدی لەسۆنگەی ئەمەوە، تاکە دەستئاوێژ بە بیروبۆچوونی ئەوان، لەڕیشەدەرێنانی جڵەوگریی قانوونیانەیە لە بن و بۆتکەوە.

## قانوون و هێزەکانی شەڕ

لە دوو چاوگەی جوداوە، ئەوانەی پێیانوایە قانوون دەستئاوێژێکە بۆ بەیەکەوەهەڵکردنی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی خەفەکردنی هەست و سۆزی شەڕانیی مرۆڤەوە، بنەوان هەڵدەگرن. لەسەرێکەوە هەندێك بیرمەند لەو گریمانەوە هەڵدەدەنێ کە گوایا مرۆڤ هەر بەسروشت، شەڕانی و بەدخوەو ناکرێ هیچ پێشکەوتنێکی جڤاکی بەبێ بوونی کۆدێکی سزای دەمکوتکار، بێتەدی.



لە ئالەکا دی، دەستەکەی تر لەو گریمانەیەوە دێنەگۆ کە گوایا مرۆڤ بەسروشت، خێرخوازە، وەلێ بەهۆی گوناه، یان گەندەڵی و بەدخویی، یان بەهۆی هەندێ لایەنی پەڕپووتی ناوەکیی مرۆڤ خۆی، مینا چاوچنۆکی، سروشتە ڕاستەقینەکەی مرۆڤ شێواوەو ئیدی لەسەرینی ئەمەوە بوونی سیستەمێکی قانوونیی جڵەوگر بۆ بەرزەفتکردنی ئەم سروشتەی مرۆڤایەتی بووە بە کارێکی پێویست. ئەوانەی بەلای ئەو گریمانە گەشبینەدا دەشکێننەوەو خۆ لە خەوشی مرۆڤایەتی دەدزنەوە، حەز بە گەڕانەوە بۆ دواوە، بۆ سەردەمی زێڕین، سەردەمی سادەیی و دڵپاکیی بەرایی دەکەن، ئەودەمەی خەڵکان ژیانێکی سادەی بەختیارو زۆر ڕێك و پێکیان رادەبارد و مرۆڤ هیچ پێویستی بە سیستەمێکی قانوونیی دەرەکی، یان لە دەمدەرەوە نەبوو بۆ ستۆپ پێگرتنی ئەو خولیاو ئارەزووانەی مرۆڤ کە لە بنەچەکەدا دروست و دووربوون لە خۆپەرستی و بۆ خێرو خۆشی گشتیی بەرەی مرۆڤ ئاراستە کرابوون. ئا ئەمە ئەو وێنە بەرابیە نموونەییە بوو کە بیرمەندو نووسەرێکی زۆر، لە (سنیکا Seneca ٤ی پ. ز — ٦٥ی ز)ەوە بگرە تا (رۆسۆ Rousseau ١٧١٢- ١٧٧٨)، بەڵکە تا بە ڕۆژی ئەمڕۆش دەگات، کێشاویانە. ئەم تابلۆ پەمەییە، لەبارەی رابردووی هەرە دووری مرۆڤ، لە نوێنەرایەتیکردنی ئەو بزاڤەی بانگەشەی بۆ سروشت گەڕانەوە لە وێنەی مرۆڤی بەراییدا دەکرد، بترازێ، شتێکی دیکە نییە، کە هێشتا سروشتەکەی بە هۆی هۆکارەکانی گەندەڵییەوە نەگەچڵاوەو نەگۆڕاوە. بەم شێوەیە ئاسۆی ئایندەیەکی کامەرانتر بۆ کۆمەڵگە کرایەوە، کە پاڵنەرە گڵاونەبووە سروشتکردەکان جێگەی سیستەمی قانوونیی لەدەمدەرەوە بگرنەوە.

دەکرێ نموونە لەسەر ئەم دوو بیرۆکە ئایدیۆلۆجیایە لەمەڕ سروشت و چارەنووسی مرۆڤ، لە چەندان سەرچاوەی پەرت و بڵاودا، کە بە چاکی دەزانین لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان بکەین، هەڵبهێنجین. لە چینی کۆندا، لە سەدەی سێی پێش زایین، قوتابخانەیەکی نامێ بە ناوی "قانووندانەر" هەبووە، بەپێی ئەم قوتابخانەیە، مرۆڤ

له بنەچەکەدا، سروشتێکی بەدو شەڕانی هەس.. ئەو ڕێگا خێرخوازانەی مرۆڤ پێیاندا دەڕوا، هۆیەکەیان بەزۆری کاریگەریی دەوروبەری جڤاکی و بەتایبەتی فێربوونی ڕێوڕەسمی ئایینی و دیسپلینی کۆدی سزاکانە. لەو پرەنسیپە بڕیارلێدراوانەی کە ئەم قوتابخانەیە بڕوای پێیان هەبووە، ئەو پرەنسیپە بووە کە دەڵێ ((قانوونێك بە سزاگەلی توندەوە تا جێبەجێکردنی دەستەبەر بکا، لە هەموو وشەی داناو حەکیمان بۆ پاراستنی نیزام خاسترە)). هەر لەو سەردەمیدا، کتێبی ((شاسترا Shastra)) لە هیندستان جەختی لەسەر ئەوە کردیتەوە کە مرۆڤ بەسروشت، چاوچنۆك و سۆزەکییە، ئەگەر جڵەوی بۆ شل بکرێ، ئەوا دنیا دەبێ بە "فابریکەی ئیبلیس "و "لۆجیکی ماسی" باڵادەست دەبێ. واتە گەورە، بچووك دەخوا. هاوشێوەی ئەم بیروبۆچوونە، لە نووسراوەکانی ژمارەیەك نووسەری ئەورووپای ڕۆژئاوای مۆدێرندا دەبینینەوە. بە لای *بۆدان* Bodin —ەوە، باری ڕەسەنی مرۆڤ، ئاژاوەو زەبروزەنگ و هێز بووە. (*تۆماس هۆبز*Thomas Hobbes -1588) 1679ژیانی مرۆڤی بەرایی، بە دۆخی شەڕێکی بەردەوام وەسف کردووەو گوایا ژیانی تاکە کەس، سەخت و پیس و کورت بووە. ئەمەیان بووە بە وەسفێکی کۆنباو. (داڤید هیوم David Hume 1776 -1711)*یش* پێیوایە کۆمەڵگەی مرۆیی بەبێ قانوون و حکوومەت و داپڵۆسین، بوونی نابێ. ئا لێرەوە قانوون، پێویستییەکی سروشتیی ئادەمیزادە. (میکافیلیMachiavelli ١٤٦٩-١٥٢٧)، وەها ئامۆژگاری شازادان دەکات: "بەڵێنان نەبەنەسەر، هەر کاتێ ئەو گفت و لفتانە لەگەڵ بەرژەوەندە تایبەتەکانی ئەواندا پێکناکۆك بوون، چونکە خەڵك هەر بەسروشت، خراپن و بەوەفا نین، بۆیە دەبێ شازادەکان، ڕێز لە پەیمانەکانی وەفاداری بۆ ئەوان، نەگرن". گریمانەی ((سەردەمی زێڕین))ی بەرایی، بەم یان بەو شێوەیە، دەورێکی گرنگی لە مێژووی ئایدیۆلۆجیای ڕۆژئاوایی گێڕاوەو چێترین شتێ کە لە بارەی ئەم گریمانەیە لە مێژووی کۆندا نووسرا بێ لە



نووسینەکانی (*ئۆڤید* Ovid 43 *پ. ز) و سینکا* بووە. *ئۆڤید* لە بەرگی یەکەمی کتێبی گۆڕانکارییەکان Metamorphoses ئەمەی نووسیوە:

"لە دەسپێکدا سەردەمی زێڕین — ئەو دەمەی مرۆڤ نرت و نوێ بوو- نەیدەزانی فەرمانڕەوایی چەس، بەڵکە هۆش و ئاوەزی ساغ و دروست هەمەچیزە بوو.
مرۆڤ هەر بەڕەمەکی بە ئاقاری خێردا هەنگاوی هەڵدێنایەوە
نەیدەزانی سام لە سزا و ترس چییە
وشەکانی سادەو ساکارو دەروونیش ڕاستگۆ
قانوونی نووسراوە پێویست نەبوو، چونکە چەوساوان نەبوون
قانوونی مرۆڤ، لە سنگی مرۆڤدا نووسرابوو
ئاپورەی خەڵك لە بەردەم دادوەردا کەڕەسیسەیان نەکردبوو
هێشتا دادگە دروست نەببوو، هێشتا وشەی دادخوازی نەبیسترابوو
هەموو شت، پارێزراو بوو، چونکە ویژدان خۆی پارێزوان بوو".

هەرچی *سینیکا* بوو، چونکە فەیلەسووف بوو، بەدرێژتر چووەتە ناو بابەتەکەو نووسیویەو دەڵێ ((لە کۆمەڵگەی بەراییدا، خەڵك بە ئاشتی و بە خۆشی و بەهەڤڕا ژیاون، سەرلەبەری شتەکان، مڵکی هەمووان بوو. ئەودەم مڵکایەتی تاکەکەسی لە ئارادا نەبوو. لەسۆنگەی ئەمەشەوە دەکرێ بێژین ئەو دەمە هەم کۆیلەتی بوونی نەبووە، هەم حکوومەتی ئۆتۆریتەش. سیستەم خاسترین شێوەی دڵخوازی هەبووە، چونکە خەڵك بە شێوەیەکی حەتمی پێڕەوییان لە سروشت کردووە، کاربەدەستانی ئەوان زۆر حەکیم و دانا بوون و ڕێنوێنی خەڵکیان دەکردو ڕێگەی خێرو خۆشییان پێ نیشان دەدان. خەڵك بە ڕەزامەندیی خۆیانەوە، بەرفرمانی حوکمڕانان دەبوون، چونکە فەرمانەکانیان حەکیمانەو دادپەروەرانە بوون، بە تێپەڕبوونی کات، ئەم بێوەیی و دڵسافییەی بەرایی وردە- وردە پووکایەوەو نەما، خەڵك، چاوبرسی و

تەماحكار بوون و هەر تەنیا بە لەزەت وەرگرتنی گشتی لە شتە جوانەكانی دنیا دانەدەكەوتن، بەڵكە حەزو ئارەزوویان لێ بووە شتەكانیش بكەنە ملكی خۆیان، چاوچنۆكی، كۆمەڵگە بەختیارەكەی هەلاهەلا كرد، ملهوڕی جێگەی بە مەملەكەتی حەكیم و دانایان چۆڵكرد و خەڵك ناچاربوون قانوونگەلێك كە حوكمڕانەكانی خۆیانی پێ ببەستنەوە، دابهێنن".

وێڕای ئەوەی كە *سینیكا* جەختی لەسەر دۆخی دڵسافیی بەرایی دەكردەوە، وەلێ ئەم دڵپاكییە ئەنجامی نەزانین بوو نەك بێوەیی و پیاوخاسی. سینیكا، بەدكاریی كۆمەڵایەتیی لەوەدواتر و پێویستیی سازبوونی حوكمی قانوونی بۆ گەندەڵیی سروشتی بنیادەم و نەمانی دۆخی دڵسافی دەگێڕایەوە. هەروا جەختی لەسەر ئەوەش دەكردەوە كە هۆی گەندەڵی بەشێوەیەكی سەرەكی دەگەڕێتەوە بۆ نەهامەتیی چاوبرسێتی. بیرۆكەی رەزالەت و گەندەڵی، وەكو بناخەیەك بۆ چەندین سەدە، دامودەزگا داپڵۆسێنەكان لە فیكری ئەوروپی رۆژئاوایی پاڵیان پێوە دابوو، ئەم بیرۆكەیەشیان لە ئامۆژگارییەكانی ئایینی عیسایی و مووسایی لەمەڕ "داڕمانی مرۆڤ"وە، وەرگرتبوو. بیرۆكەی بەهەشت لە تەوراتدا، هاوشێوەی بیرۆكەی دۆخی دڵسافیی بەراییە لە كن مرۆڤی *سینیكا*، هەروا بناخەكانی پێویستیی قانوون و دامەزراوە هاوشێوەكانی قانوون وەكو دەوڵەت و ملكایەتی تایبەت و كۆیلەتی لە سروشتی چەوت و چەوێلی مرۆڤ كە لەو "داڕووخانە" كەوتوونەتەوە، وەرگیراون. ئا ئاوا قانوون بۆ راگرتنی شوێنەوارە بەدەكانی گوناه، بووە پێویستییەكی سروشتكردی دوای "داڕووخان"، تەنانەت خێزانیش وەكو ئاكامێكی "داڕووخان" مامەڵەی لەتەكدا كراوە، چونكە خێزان كۆنترۆڵی زۆرەملێی نێرینە وەكو ئەڵتەرناتیڤێك بۆ ئازادی و یەكسانی لە بەهەشتی سەرەتاییدا دەردەبڕێت. هەروا كۆیلەتیش بە ئاكامێكی حەتمیی "داڕووخان" بە ئەژمار دێت، چونكە مرۆڤ، وێڕای ئەوەی كە لە باری ناگەندەڵیدا بە سەربەست و



هاوشانی مرۆڤێكی دی دادەنرا، لە ئاكامی گوناهكردندا بووە بابەتێكی لەباری كۆیلایەتی. بەم شێوەیە كۆیلەتی بووە دامەزراوێكی رەوا لە سەردەمی گەندەڵیدا.

تیوری قانوون و حكومەت لە نووسینەكانی (*ئۆگستین* Saint Augustine *٣٥٤- ٤٣٠* )دا، بە چلەپۆپەی خۆی گەیشت، قانوونی دەوڵەت و داپڵۆسین هەر لە خۆیانەوە بەد نین، بەڵكە هەردووكیان بەشێكن لە سیستەمی خودایی وەكو دەستاوێژێك بۆ جڵەوگرتنی ئەو عەیب و خەوشانەی مرۆڤ كە لە گوناه دەكەونەوە. ئا لێرەوە، سەرلەبەری دامەزراوە لەئارادابووەكانی قانوونی و دەسەڵاتەكانی دەوڵەت رەوان و دەشێ بۆ بەهەند هەڵگرتنیان داپڵۆسین بەكاربهێندرێ. بەڕای *ئۆگستین* هیواو ئومێدی مرۆڤایەتی تەنیا لە چوارچێوەی ریفۆرمی كۆمەڵایەتی و هێنانەئارای رژێمێكی دادپەروەرانەتر لەسەر رووی زەوی خۆی نابینێتەوە، بەڵكە بە وەدیهێنانی كۆمەڵگەیەكی تایبەت بە ((دەستبژێرانی خودا)) دێتە دی، ئەویش ئەو كۆمەڵگە ئەفسانەییە كە لەدواجاردا، ئەو كاتەی خودا خۆی حەز بكا، خێرو خۆشی گشتی بەسەر سیستەمی مەوجود كە سروشتی هەڵەكارانەی مرۆڤی بەسەردا زاڵە، جێگەی خۆی دەگرێ.

بۆ چەندین سەدە، تیوری *ئۆگستین* لەمەڕ قانوون بەو پێیەی پێویستییەكی سروشتكردە بۆ جڵەوگرتنی سروشتی هەڵەكارانەی مرۆڤ، بالادەست بوو. ئۆگستین لەكاتێكدا نووسینەكانی خۆی بلاودەكردەوە كە سیستەمی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریای رۆمانی بەرەو داهێزران و داڕووخان دەچوو، بۆرە ئومێدێك هەبوو كە بەرەی مرۆڤ بە ویست و خواستی خۆیان سیستەمێكی رێكوپێك و دادپەروەرانە دابمەزرێنن. وەلێ ژیان وردە وردە هێوری و بنەجێ بوو و ئومێدێك بە ئەگەری وەدیهێنانی پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی- ئابووری پەیدابوو. لەدەسپێكی سەدەی سێزدەمدا، بیروڕا فەلسەفی و زانستییەكانی چاخە كۆنەكان لەمەڕ باری كۆمەڵایەتی مرۆڤ، بەتایبەتی بیروراكانی (*ئەرستۆ* Aristotle *٣٨٤ پ.ز- ٣٢٢*

*پ.ز)*، خزانه ناو ئەوروپای رۆژئاواوه، کاتی ئەوه هات گۆڕان له بیروڕا بڕواپێهێنراوەکان رووبدا. چونکه دەشێ سروشتی مرۆڤ بەدکارانەو چەوت و چەوێڵ بێت، وەلێ هێشتا مرۆڤ فەزیلەیەکی سروشتکردی بەتوانای پەرەسەندنیشی هەس. *(ئەکوینی* Thomas Aquinas *١٢٢٥ - ١٢٧٤)* بەپێچەقاندن لەسەر چەمکی *ئەرەستۆ* لەبارەی گەشەسەندنی سروشتیی دەوڵەت لەسۆنگەی پاڵنەره کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤەوه، دووپاتی کردەوه که بەناچاری دەوڵەت بەد نییه، بەڵکه دامەزراوەیەکی سروشتکرده بۆ پەرەسەندنی خێرو خۆشی مرۆیی. *تۆماس ئەکڤا ئەکوینی* تێکۆشا، که ئەم هەڵوێست و ئەو هەڵوێست، لەگەڵ هەڵوێستی باوی لاهووتی لەسەردەمی خۆیدا بەیەکەوه گرێبدا، سەرباری ئەوەش تۆماس ئەکوینی بناخەیەکی گشتی بۆ چەمکی عەلمانیی قانوون که دواتر بووه باڵادەست، دانا، کاتێك که قانوونی نەك هەر تەنیا به هێزێکی بەسوود بۆ جڵەوگرتنی خولیا بەدەکانی مرۆڤ لەقەڵەم دا، بەڵکه هەروا قانوونی بۆ بەیەکەوەهەڵکردنی کۆمەڵایەتی و خێرو خۆشیش خستەگەڕ. ئا لێرەوه چی دی وەکو هێزێکی نەگەتیڤی رووت بۆ جڵەوگرتنی شەڕو بەدکاری، سەیری قانوون نەدەکرا، بەڵکه وەکو ئامرازێکی کارا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی مرۆڤ که پاڵنەره کۆمەڵایەتییەکان، یان خێرخوازەکان بەری مرۆڤ دەدەنە ئەو ئامانجانه.

## ئایا مرۆڤ بەسروشت خێرخوازه؟ چەمکی ئانارشیستی

دیتمان چۆن که هەوڵی دانانی قانوون وەکو پێویستیەکی سروشتکرد به ئاقاری جڵەوگرتنی غەریزه بەدەکانی مرۆڤ، وەکو تاکه رێگایەکی شیاو بۆ به ئەقڵانی کردنی لایەنی کۆمەڵایەتیی سروشتی مرۆڤ و ئاراستەکردنی، دەرفەتی لەبەردەم تێڕوانینێکی نوێ بۆ قانوون کردەوه، وێڕای ئەوەش له هەموو سەردەمێکدا



بیرمەندی وەها پەیدا بوون، چەمکی داپڵۆسێنانەی هێزەکانی قانوون و نیزام رەتبکەنەوه. بەلای ئەو بیرمەندانەوه، مرۆڤ هەر بەسروشت خێرخوازەو تا سەریش وەکو خۆی دەمێنێ، ئەوه ژینگەو دەوروبەری کۆمەڵایەتییه، که بناخەی بەدکارییەکانی دۆخی مرۆییه، بەتایبەتی بوونی سیستەمێکی قانوونی لەسەرەوه بەهێز داسەپاو.

ئەوەی که پێی دەگوتری فیکری ئەنارشیستی هەر له کۆنەوه تا سەردەمی مۆدێرن، تا رادەیەك بەوه جیا دەکرێتەوه که جۆره حەزو ئارەزوویەکی به پەلەی گەڕانەوه بۆ دۆخی بەرایی و سۆزێك بۆ سەردەمی یەکەمی زێڕین هەیە. بۆ نموونه، *ئەفلاتوون* مەیلێکی توندی بەلای پریمیتیزمدا هەبوو هەروەکو لەم سێ ودوونەکردنەیدا دەردەکەوێت ((خەڵك له سەدەکانی بەرایی، هەم له ئێمه چاتر و هەم له خوداش نزیکتر بوون)). وەلێ ئەم روانگەیه زۆر لەخۆکردنێکی تێدایه و زێتر پشتی به رابردوویەکی خەیاڵئامێزی مرۆڤ بەستووه، تا پشتدان به وزەی پەنامەکیی مرۆڤ بۆ وەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی دادپەروەری نموونەیی. سەرباری ئەوەش، ئەم کۆمەڵگه نموونەییه، بەرفرمانی سیستەمێکی قانوونیی نموونەیی نەبووه، بەڵکه به پێچەوانەوه کۆمەڵگەیەکی بێ بنەماو رێساگەلی قانوونی بووه، که تیایدا له سەرینی پاڵنەره کۆمەڵایەتییەکان و هەستی چاکەخوازیی ئەندامەکانییەوه، بەیەکەوه گونجانی کۆمەڵایەتی باڵادەست دەبێ.

*ئەفلاتوون* له کۆمارەکەیدا The Republicروونی کردبووەوه که وێنەی نموونەیی ئەم چەشنه دەوڵەته بێ قانوونه، پێکەوەهەڵکردنی ناوەکیی خۆی له ئاوەزی مرۆڤەوه هەڵدێنجا که دەگاته ئاستی هەره سەرەوەی پەیژەکانی پەرەسەندن له رێگەی یەك بەدوای یەکداهاتنی پاشا فەیلەسووفەکانەوه که به دانایی و زانایی خۆیان دەستنیشان دەکران. ئەفلاتوون بڕوای به سیستەمێکی خوێندن و فێرکردن هەبوو که نەك هەر فەرمانڕەوای لێوەشاوه پێبگەیەنێ، بەڵکه هاوولاتی دیش وا بار بهێنێ که بەرفرمان

و دڵسۆز بن. تاقیکردنەوەی مۆدێرن ئەو بڕوایەی *ئەفلاتوون* پشتڕاست دەکاتەوە کە خوێندن و فێربوون، یان ((مێشك داشۆرین)) دەشێ خەڵکی لەسەر ملکەچبوون رابهێنێ، وەلێ هەر ئەو تاقیکردنەوانە هاودەنگ نین سەبارەت بەو بیرۆکەیەی کە داخوا چ سیستەمێکی فێرکردن دەشێ رێگە بۆ پاشایەتییەکی دانا خۆش بکا، یان داخوا رێگەیەکی دی هەیە کە لە هەڵبژاردندا، یان لە راهێنانی ئەو تاکانەی کە بەسروشت شیاون بۆ بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حوکم، بەهەڵەدا ناچێ.

رەنگە بگوترێ ئەم مەیل و خولیایەی *ئەفلاتوون* هەندەی بەرەو ئەوەی ئەمڕۆ توتالیتاریزمی پێ دەوترێ، یان بەرەو دەسەڵاتی هەمەچیزانەی دەوڵەت، دەخزی، هێندە بەرەو ئانارشیزم نەدەڕۆیی. ئەمەش بەپێی ئەو پێشنیارانەی کە لە کتێبی "قانوونەکان"ی ئەفلاتووندا لەمەڕ سیستەمێکی توندو یەکلاکەرەوەی قانوونی، هاتوون. وێڕای ئەوەی کە بۆنی هەندێ بیچم و چارەی ئانارشیزم لە مەسیحیەتی بەراییدا دەکرێ، وەلێ ئەمە زێتر بێزبوونەوە بووە لە قانوونی مرۆیی تا رەتکردنەوەی، راستییەکەی گوتەی ((چ هی قەیسەرە، بیدەن بە قەیسەر)) بۆیەی شەرعیەت لە دەسەڵاتەکانی ئارا دەدا. لەهەمان کاتدا زۆر لە ناحەزانی مەسیحییەتی بەرایی پێیانوابوو کە پرەنسیپی ئاشتیخوازی و نا- توندوتیژ هەڕەشەیە بۆ سەر دەسەڵاتی دەوڵەت و رێگەی بۆ پرەنسیپەکانی ئانارشیزم کردەوە کە هەندێ گەورە نووسەری هاوچەرخ لە بابەتی *باکۆنین و تۆلستۆی* دەیانگوتەوە.

سەردەمی مۆدێرن هەر لەدەسپێکی سەدەی نۆزدەمەوە، بەپێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا لە سەردەمەکانی دی جیا دەکرێتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ئەم بەخۆکەوتنەدا، ئایدیۆلۆجیای پێشکەوتنی مرۆییش گەشەی کرد. ئەم ئایدیۆلۆجیایە، تێڕوانینێکی دنیاخوازانەو بڕوای بە بیرۆکەی بەهەشتی بەرایی نییەو چاوی بڕیوەتە ئایندەیەکی رازاوەتر بۆ مرۆڤایەتی. ئەم پرەنسیپە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم بیرۆکەیەی گرتەخۆ کە دەڵێ: دەشێ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بۆ دەوری ئازادانەی ئەو هێزە



ئابوورییانە جێبهێڵدرێ کە بۆ قازانجی بەیەکەوەگونجاندنێکی گەورەتری کۆمەڵایەتی کار دەکەن، ئەگەر ئەو هێزانە بەبێ دەستێوەردان بەرهەڵدا بکرێن. ئا ئەمە تیوری "ئازادیی کار"، یان مایەی خۆتێنەکردنی نامی بە" Laissez –faire " کە فەیلەسووفی ئابووریناس *(ئادەم سمیت* Adam Smith *١٧٢٣ - ١٧٩٠)* بەشێوەیەکی تایبەت بەسەر کاروباری ئابووریدا پراکتیزەی کرد، وێڕای ئەوەی کە ئەم تیورییە لە ناوەخنی خۆیدا، دۆکترینێکی فرەتری بەخۆوە گرتووە کە دەڵێ ((لەڕووی پرەنسیپەوە، هەر حکوومەت و قانوونێك تا ئەو مەودایە بەدو ناحەزە کە پەرەسەندنی سروشتیی ئابووری و کۆمەڵگە کۆت و بەند بکا، یان بشێوێنێ)). بەڵام ئەم تیورییە لەو رووەوە پێچەوانەی ئانارشیزمە کە پێی باش بوو قانوونی داپڵۆسێنانە بۆ پاراستنی ملکایەتیی تایبەت کە چاکەیەکی دەست لێنەبووەوەی بازاڕی ئازادە، بەتوندی بەکار بێت.

ئەم بۆچوونە لە سەدەی نۆزدەدا گەیشتە چلەپۆپە لە کتێبی ئەنارشیستەکان، بەئاگا لە بیروڕای مۆدێرن، هەرچەند کتێبی نامێی "دادپەروەریی سیاسی" ی *(ویلیەم **جودوین*** Godwin *١٧٥٦ - ١٨٣٦)* بۆ یەکەمجار ساڵی ١٧٩٣ هاتەوەشاندن. *جودوین* پێیوایە بەدکارییەکانی کۆمەڵگە لە سروشتیی هەڵەکارانەو گەندەڵانەی مرۆڤەوە هەڵنەقوڵیون، بەڵکە لە شوێنەوارە خراپەکانی دامودەزگای داپڵۆسینەوە سەرچاوەیان گرتووە. مرۆڤ توانایەکی بێ سنووری بۆ پێشکەوتن هەیە، تەنیاو تەنیا دامودەزگاکانی داپڵۆسین و نەزانین رێگە لەم پێشکەوتنە دەگرن.

*جودوین*، متمانەی ڕەهای بە ئەقڵ و ئاوەزی مرۆیی و توانای کامڵبوونی هەبوو و جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە لە توانادا هەیە لەرێگەی بارهێنان و هاریکارییەوە، قانوون هەڵبوەشێندرێتەوە. ئەم رێساگەلە مۆراڵی و کۆمەڵایەتییانە بۆ پاراستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن بە پێویست دەزاندرێن و کاراو بەرکار دەبن، چونکە پێخوستکردنیان، لۆمەو بێزاریی تاکە ئازادیخوازەکانی

کۆمەڵگەیان لێدەکەوێتەوە. هەردوو پێشەوای قوتابخانەی ئەنارشیستی رووسی: *باکۆنین* Bakunin و *کرۆپتکین* Kropotkin داکۆکیان لەم چەمکە فەلسەفییە کرد و پێیانوابوو دەوڵەت و قانوون و داپڵۆسین و ملکایەتیی تایبەت دژمنانی کامەرانیی مرۆڤایەتی و خێرو خۆشی گشتین. ئەم دوو نووسەرە پێیان لەسەر بەکەڵکیی هاریکاری لە دیرۆکی مرۆییدا داگرتووە، رایانگەیاند کە رەوەندی پەرەسەندنی حەتمی بەو سەمتە دەچێتە پێشەوە کە پرەنسیپی هاریکاریکردنی یەکتر جێگەی کۆمەڵگەی داپڵۆسێنەر دەگرتەوە. لەسەرێکی دییەوە *تۆلستۆی* بانگەشەی بۆ شێوەیەکی ئانارشیزم کرد کە پاڵی بەو هزرەی خۆی دەدا لەمەڕ ژیانێکی ساکارانەی فەلانەی ئیلهامگر لە خوا کە کۆمەڵگە بەراییەکانی فەلان تیایدا دەژیان. لایەنگرە دڵگەرم و تاوگرتووەکانی *تۆلستۆی* هەوڵیاندا "کامپگەلی تۆلستۆیی" لەسەر ئەو بنەمایانە لە چەندین جێگەی دنیادا دروست بکەن، وەلێ رەنج بەخەسار بوون. *مەرموود* Aylmer Maude لە کتێبەکەی خۆیدا "ژیانی تۆلستۆی"، هەندێ رێگەی گاڵتەجاڕانەو نامۆ و سەیرو سەمەرە دەگێڕێتەوە کە بوون بە مایەی داڕووخانی خێرای ئەم کامپانە. لە یەکێ لەم کامپانە، بۆ نموونە، منداڵێك، "بەروانکە" یەکی لە هاوڕێیەکی خۆی دزی، ئەم منداڵە پێشتر، وا تەلقین درابوو کە ملکایەتی تاکەکەسی حەرام و ناڕەوایەو پۆلیس و دادگە وەك بەشێك لە سیستەمێکی داپڵۆسێنەرانەی بێ رەوشت بەولاوە شتێکی تر نین. کاتێ کە داوا لەو منداڵە کرا "بەروانکە"کە بداتەوە، منداڵەکە قایل نەبوو بەروانکەکە بداتەوە چونکە باش لە دەرسەکە حاڵی ببوو. پرسی: ئەگەر ملکایەتی هەڵەیە، بۆ دەبێ بۆ ئەو چەوت و چەوێڵ تر بێ لە پیاوەکە؟ منداڵەکە گوتی ئەویش هەندەی ئەو پیاوە پێویستیی بە بەروانکەکە هەیەو، حەزی لێیە ئەم پرسە وتووێژی لەسەر بکرێ و سوور بوو لەسەر بۆچوونی خۆی کە هەقی وییە بەروانکەکەی لەلا بێ و لێساندنەوەی هەڵەیەکی مەزنە.



کامپێکی دی هەمان چارەنووسی بەخەم و کەسەری تووش بوو. کەلوپەلەکانی کامپەکە بەناوی ئەندامێکی کامپەکەوە کڕان تا بۆ بەرژەوەندی هاوڕێیەکانی خۆی بەکاریان بهێنێ. رۆژێکیان، پیاوێکی لایدە هاتە ناو کامپەکەو پاش گفتوگۆ لەگەڵ ئەندامانی کامپەکە لەپڕ راوەستاو پێی گوتن: ئاغایان دەمەوێ لەو ساتەوە پێتان بڵێم هیچ کام لە ئێوە نە ماڵ، یان زەویتان لەم کامپەدا نییە، ها بۆ وا مات و مەندەهۆش بوون؟ ئەم مەزراو بەراوو خانووبەرەو رەزانە، سەرلەبەریان، ئێستا ملکی منن. من سێ رۆژ دەرفەتتان دەدەمێ تا لێرە باربکەن و بڕۆن. دانیشتوان سامگرتوو بوون، وەلێ بەرەنگارییان نەکردو کامپەکەیان چۆڵکرد، دوای دوو رۆژ ئەم ملکدارە شەرعییە، ملکەکەی بە حکوومەتی خۆجێی کۆمیون دا.

ئەوەی لە خەڵك بەدگومان بێ سەبارەت بە بڕوابوون بە دڵسافیی سروشتکردی مرۆڤ، لەبەرەخۆی پێدەکەنێ، وەلێ دەرەنجامی ئەم پراکتیکە ئەنارشیستە ساویلکانەیە ئاماژە بۆ ئەو تەنگژەیە دەکا کە هەر دەبێ رووبەرووی ئەوانەی بڕوایان بەوە هەیە کە دەشێ کۆمەڵگە دوور لە بیرۆکەی قانوونی بەخورتی دەرەکی رەوتار و کار بکا، ببتەوە. مود دەڵێ: قانوون هەڵوەشێننەوەو خەڵکی بڕوا پێ بێنن کە نابێ قانوون، یان هۆڵی دادگە هەبێ، ئەو دەمە دەبینن تەنیا ئەو کەسانە دەشێن بژین کە لە شێوە ژیانی کلاسیکی گوندەکی راهاتوون لە بابەتی جۆتکارانی بەر لە شۆرشی رووسیا. بناخەی بەدکارانەی تۆلستۆیزم ئەوەیە کە تۆلستۆیزم بەرەنجامی ئەو شارەزاییە ریسواو مەحکوم دەکا کە باووباپیرانمان وەدەستیان هێناون، ئەوانەی سیستەمێکیان داناوە وێڕای ئەو خەوشانەی رێگە لەو سیستەمە دەگرن، تا خەڵکی بکارن هاریکاری یەکدی بکەن و ئیشوکاری خۆیان بە کەمترین رووگرژی و پێکهەڵپژان، جێبەجێ بکەن.

رەنگە گەورەترین تێز لەرووی کاریگەرییەوە، ئەو تێزە بێ کە ئەنارشیستی هاودەم *"کارل مارکس"* نووسیویە، مارکس هزری دەکرد کۆمەڵگەی سەرمایەداری بە

شۆرشی بەزەبروزەنگی پرۆلیتاریای چەوساوە سەراوبن بکریٚ. *مارکس* قانوونی بەتەنیا بە سیستەمیٚکی داپڵۆسیٚنانە بۆ پاراستنی ئیمتیازی چینی ملّکدار دادەناو شۆرشیش، کۆمەڵگەیەکی نا چینایەتی لیٚدەکەویٚتەوە. ئیدی قانوون و دەولّەت هەڵدەوەشیٚنەوە، چونکە هیچ پیٚویستییەك بۆ پشتەوانیکردنی سیستەمیٚکی داپڵۆسیٚنەرانە نامیٚنیٚ. بابای مارکسیست سەیری بەردەمی خۆی دەکا و ئاوڕ لەدواوە ناداتەوە، ئەو چاوی لە سەردەمیٚکی زیٚرینە کە بەیەکەوەگونجاوی کۆمەڵایەتی تیٚدا باڵادەست بیٚ بە هۆی دلّسافیی رەسەنی سروشتی مرۆڤ کە دامەزراوەی ملّکایەتی تایبەت کرمیٚی نەکردووە. ئەم بەهەشتە کۆمەڵایەتیە بەشەوو رۆژیٚك نایەتەدی، چار نییە دەبیٚ ماوەیەکی گواستنەوە هەبیٚ — هەڵبەت ماوەکەی دیار نەکراوە- کە تیایدا دەولّەت چالاکییەکانی خۆی بە پشتئەستوری هەموو دەستاویٚژەکانی داپڵۆسین کە ئەنارشیستەکان بیٚزیان لیٚ دەبیٚتەوە پراکتیزە دەکا. لە فەسلّەکانی دادیٚ لە بارەی تیوری مارکسیستی لەمەڕ قانوون زیٚتر دەدویٚین و بەوە وازدیٚنین کە سۆسیالیزمی مارکسیستی زیٚتر بۆ بەرفرەکردنی قانوون و داپڵۆسین لە جیاتی هەڵوەشاندنەوەیان کاری کردووە.

## دلّسافیی رەمەکی و نرخی شارستانیٚتی

وێڕای تاقیکردنەوەی سەرنەگرتوو، هیٚشتا بیرمەندی هەلّکەوتووی وا هەن کە بانگەشە بۆ ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە گوایا مرۆڤی بەرایی هەر بەخۆڕسك خاس بووەو ئەوە ریٚکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ژیانی شارستانیٚتیە کە تۆوی زەبروزەنگ و ئاژاوەی ناوەتەوە و لە ئاکامدا سیستەمگەلیٚکی داپڵۆسیٚنەرانەی قانوونی لیٚکەوتیتەوە. یەکیٚ لەم بیروڕا سەرەکییانەی کە لە کتیٚبی "میٚژووی مرۆڤایەتی " (*ئەلیۆت سمیت* Eliot Smith ١٨٨٨ - ١٩٦٥) دا کە بۆ یەکەم جار لە سالّی ١٩٣٠دا بلاّوبووەوە ئەوەیە کە توخمی مرۆیی هەر لەبنەچەدا خاس و



ئاشتیدۆستە و لەمبارەوە دەڵیٚ ((ساغکردنەوەی ئەمە روون و دیارو فرەیە بە شیٚوەیەك کە وتوویٚژ لەبارەی نکولّیکردنی هەندیٚ خەلّك لە رەمەکیی دلّسافیی مرۆڤ و خولیای رەمەکیانەی بەیەکەوەژیانی بەئاشتی، مەسەلەیەکی دەروونییە. هەر تاکیٚ لە ئیٚمە بە تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆی دەزانیٚ کە هاوەلّەکانی بە گشتی چەند ناسك و خۆش مەشرەبن. زۆربەی بەیەکهەلّشاخان و ناتەباییەکان لە ژیانی ئیٚمەدا ئاکامی ئەو ململانەیەن کە شارستانیٚتی خۆی دروستیان دەکا. ئیرەیی و کینەو بەدگۆیی و هەموو شیٚوە جیا-جیاکانی زەبروزەنگ، ئامانجیٚکی دەسکرد دەردەبڕن و مرۆڤی بەرایی لیٚیان بەرییە.

کەمینەیەك نکولّی لەوە دەکەن کە زۆر لەو نەساغییانەی بەدەستیانەوە دەنالیٚنین ئاکامیٚکی راستەوخۆی ئەو گرژی و ماندوبوون و ململانانەن کە شیٚوەی بوونی شارستانیٚتی ئالّۆزیان پیٚ جیا دەکریٚتەوە. خویایە کە ئەو بەراوردەی ئەلیوت لە نیٚوان مرۆڤی بەرایی و مرۆڤی شارستانی کردووە، بەراوردیٚکی تاسەر ئیٚسقان سادەو تاك لایەنەیە. خویٚنەرانی کتیٚبی "فرنکشتاین Frankenstein" ی *ماری شیلی* Mary Shelley بەبیریان دیٚتەوە کە چۆن فرنکشتاین دڕندەیەك لە شیٚوەی مرۆڤ دروست دەکا کە هەموو هەستیٚکی مرۆڤانەی هەبووە، وەلیٚ دوایی لە رووی ئافەریدەکەی هەڵدەگەڕیٚتەوە و دەیکوژیٚ. ئەم رۆمانە ئاماژەیە بۆ دوالیزمی خووی مرۆیی. رەنگە مرۆڤ خولیای رەمەکی بەرەو چاکە هەبیٚ واتە ئەو پیٚوەندییانەی کە لە سۆزو هاریکاری دەکەونەوە و بەبیٚ ئەوان ژیانی کۆمەڵایەتی ئاستەم دەبیٚ. وەلیٚ روویٚکی دینامیکیش لە سروشتی مرۆییدا هەیە کە دەکریٚ بۆ مەبەستی داهیٚنەرانە، یان کاولکارانە ئاراستە بکریٚ.

فەیلەسووفی ئەنارشیستی رووناکبین، تەنانەت کاتیٚ کە گرنگیەکی زۆریش بە پالّنەرە خولقیٚنەرەکان دەدا، هەولّ دەدا خۆی لە رووە تاریکەکەی سروشتی مرۆڤ نەبان بکا، یان بیشاریٚتەوە. بۆ نموونە *هربرت رید* Herbert Read دەڵیٚ: ((کۆڕو

کۆمەڵەی مرۆیان بە شێوەیەکی ڕەمەکی لێکدی خڕدەبوونەوە تا هاریکاری یەکدی بکەن و پێداویستییەکانیان دابین بکەن و ئا ئاوا دەیانتوانی بە کەیف و ماشای خۆیان پشت بە یەکتری ببەستن تا ئابوورییەکی بەکۆمەڵ کە ئاتاجی خۆیانی پێ دابین بکەن، ڕێکبخەن)). هەروا دەڵێ: ((بابای ئەنارشیست پێی وایە کۆمەڵگە بریتییە لە لەنگەرڕاگرتن، یان بەیەکەوەهەڵکردنی کۆڕو کۆمەڵەکان. تاکە زەحمەت و دژوارییەك ئەوەیە کە چۆن پێکەوەهەڵکردن لە پێوەندییەکانی ناوەکیدا دروست دەبێ)). وەلێ داخوا پەرەپێدانی ئەم بەیەکەوەهەڵکردنە ئەرك و فەرمانێك نییە کە دەبێ وەپاڵ جۆرێك لە ڕێکخستنی دەوڵەت بدرێ؟ وەلامی *هربرت رید* دووی ڕووی هەیە: یەکەم ئەو پێیوایە ئەم ئەرك و فەرمانە تا ڕادەیەکی زۆر بەدوورخستنەوەی هاندانی ئابووری لە کۆمەڵگەدا نامێنێ. بۆ نموونە تاوان تا ڕادەیەکی مەزن، کاردانەوەیەکە لەهەمبەر دامەزراوەی مڵکایەتیی تایبەت. دووەم: دەڵێ ((بارهێنانی منداڵ و ئاکارو ڕەوشتی گشتی، پرسگەلێکن پێوەندییان بە تێگەیشتن و درك پێکردنەوە هەیەو دەبێ بە گەڕانەوە بۆ ویستی چاکەخوازانەی ڕەسەن لەکن کۆڕو کۆمەڵەکان چارەسەری بکەین، هەروا دەکرێ هەر ناتەباییەك لە چوارچێوەیەکی خۆجێی چارەسەر بکرێ کاتێ کە دەسەڵات لە باری جیهانییەوە دەبێ بە نا- سەنتڕاڵ و ژیان سادەو ساکاری لێ دێو " قەوارە نامرۆییەکان"ی وەکو شارو باژێری مۆدێرن، دەپوکێنەوە. کۆڕوکۆمەڵەی خۆجێی دەتوانن دادگەی تایبەت بە خۆیان هەبێ، ئەم دادگانە بەسن بۆ جێبەجێکردنی قانوونی گشتی پشتئەستوور بە درکپێکردن و تێگەیشتن.))

وەکو تێبینی دەکرێ *رید* لە گەڵ ئەنارشیستەکانی دی جیاوازیەکی هەیە لەو ڕووەوە کە ددان بە پێویستیی جۆرێك لە قانوونی گشتی دەنێ و تەنیا سوورە لەسەر ڕەتکردنەوەی سەرلەبەری دامودەزگا داپڵۆسێنەکانی دەسەڵاتی ناوەند. رید ڕوونی دەکاتەوە کە "ئەنارشیزم" واتە کۆمەڵگەیەکی بێ حوکمڕان، نەك کۆمەڵگەیەکی بێ قانوون و هەروابێتەوە کۆمەڵگەیەکی بێ نیزام. بابای ئەنارشیست کۆنتراکتی



کۆمەڵایەتی لا پەسندە، وەلێ بە شێوەیەکی تایبەتی لێکیدەداتەوە و پێیوایە ئەو ڕێگە هەرە خاسەیە کە ئەقڵ و ئاوەز پەسندی دەکا.

دانانان بەوە کە سیستەمێك لە ڕێساو قانوونگەل تەنانەت لە سادەترین شێوەی کۆمەڵگەدا پێویستە، کارێکە ئەملاو ئەولای پێ ناوێ. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، سەرەتایی بێ، یان پەرەسەندوو، پێویستە ڕێساو قانوونگەلێك هەبن تا ئەو مەرجانە دیاری بکەن کە ژنان و پیاوان بتوانن ژن ومێردایەتی خۆیان بکەن و لەسایەیدا بژین. قانوونگەلی وەسا هەن کە پێوەندییەکانی خێزان ڕێکدەخەن، قانوونگەلی دی چالاکییە ئابوورییەکان و کۆکردنەوەی خواردن، یان ڕاوو شکار، قانوونگەلی واش هەن کە ئەو کاروکردانەی زیان بە بەرژەوەندیی خێزان، یان تیرەو هۆزو کۆڕو کۆمەڵەکە بە گشتی دەگەیەنن حەرام دەکەن. سەرباری ئەوەش تەنانەت لە کۆمەڵگەی شارستانیی ئاڵۆزیشدا، تەنانەت ئەگەر بە پلەیەکی واش سادە بکرێتەوە کە لەسەر دڵی بابای ئەنارشیست خۆش بێ مینا *رید*، دەزگایەکی قانوونی وا هەر دەمێنێ کە ژیانی خێزان و ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕێکبخات. ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت: کۆمەڵگەی مرۆیی، جا لە هەر ئاستێکدا بێت، دەشێ لەسەر بناخەیەك دابمەزرێ کە هەر مرۆییەك بتوانێت ئەو کارە بکات کە خۆی بەڕاستی دەزانێت، بیرۆکەیەکی خەیاڵییەو شایانی هیچ بایەخپێدانێك نییە. چونکە کۆمەڵگەیەکی لەم بابەتە، هەرگیز هەروەکو *رید* دەڵێ ((کۆمەڵگەیەکی بێ نیزام)) نابێت، بەڵکە دەبێتە نەمان و ڕەدکردنەوەی هەمان کۆمەڵگە.

ئا لێرەوە وتوویژ سەبارەت بە پێویستبوونی قانوون لە کۆمەڵگەی مرۆییەوە دەستپێدەکات بۆ پرسیارێکی دی کە پێوەندییەکی توندو تۆڵی بە باسەکەوە هەیە: داخوا دەکرێ بیرۆکەی قانوون لە سیستەمی داپڵۆسین جودا بکرێتەوە؟ لە فەسڵی دووەمدا وەڵامی ئەمە دەدەینەوە.

# قانوون و هێز

له پانتیۆنی Panthion میزۆپۆتامیا، دوو خواوەند هەبوون، که ریزی زۆریان لێ دەندراو به پیرۆز دەزاندران: ئەو دووانەش ئانو Anu ی خواوەندی ئاسمان و ئینلیل Enlil ی خوداوەندی باهۆز بوون. گەردوون cosmos، به دەوڵەتێکی که خواوەندان فەرمانڕوایی بکەن، دەچوێندرا. لێ لەنێوان دەوری ئەم دوو خواوەندە سەرەکییەی ناو زنجیرەی خواوەندان، جیاوازییەکی یەکلاکەرەوە پەیدا بوو. لە لایەکەوە خواوەندی ئاسمان که فەرمانی دەدا، دەبوایە مل بۆ ئەو فەرمانە دابنەوێندرێ، هەر لەبەر ئەوەی فەرمانی خواوەندی هەرە مەزن بووە. ئا بەم شێوەیە بەرفەرمانبوون بووە پێویستیەکی بێ چارە و فەرمانێکی توندی وتووێژهەڵنەگر. ئانو لە سیستەمی گەردوونیدا، هێمای دەسەڵات بوو. تەنانەت لەسایەی ئەم ستاتۆ statuteەشدا، دەسەڵاتی خواوەندان —بە هەموو شەقڵە رەها بێ کۆت و مەرجەکانییەوە- هیچ گەرەنتییەك نەبووە کە خواوەندپەرستان لەخۆوە مل بۆ ئەو فەرمانانەی لەسەرەوە دەهاتنە خوارەوە کەچبکەن. ئیدی لە سۆنگەی ئەمەوە بەناچاری دەبوایە دەقگەلێك بۆ سزادانی سەرپێچیکاران، جا خواوەند بوونایە یان بنیادەم، دابندرێ. ئا لێرەوە، هێزی باهۆز "ئینلیل"، هێزی بەزۆر، خواوەندی ناچارکردن، کە بڕیاری خواوەندانی جێبەجێ دەکرد و لە شەڕدا رێبەرایەتی دەکردن، پەیدابوو.



ئەگەر بە قوڵاییدا رۆبچین، زۆر شتی بنچینەیی لە رەوتارو ئامانجی مرۆیی لەناو ئەفسانەی کەونارادا دەبینینەوە. هەردوو ئەفسانەی ئانو و ئینلیل، ئەو هەستە قوڵە مرۆییە سەبارەت بە پێویستبوونی نیزام و ئەو باوەڕە دەردەبڕن کە نیزامێکی لەمجۆرە — چ لە ئاستی ئاسمانی و چ لە ئاستی دنیایی- پێویستیی بە دوو توخمی بنچینەیی و هاوبەند هەیە: دەسەڵات و زۆرنواندن. چونکە بەبێ داننان بە دەسەڵاتێك کە قانوونگەل و بنەماکانی ئەو دەسەڵاتە، قەوارەی ئەو نیزامە لە جیهاندا بڕیار دەدەن، شتێك نابێ بە ناوی کۆمەڵگەیەکی ئۆرگانیزەکراو. پاشان دەسەڵاتی حوکمی خودایی، دەشێ گەردوون وا لێ بکات وەکو گشتێکی کۆمەڵایەتی کار بکا. لێ گەردوون-یش بەبێ بوونی توخمی هێز کە ملدان بۆ فەرمانی خودایی دەستەبەر دەکا، هەرگیز ناگاتە دەوری دەوڵەت. ئا ئاوا دانیشتوانی وڵاتی میزۆپۆتامیای کەونارا ئەم دوو مەرجەی پێشەوەیان بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی خۆیان بە پێویست دانا کە لەسەر رووی پان و پۆڕی گەردوون رەنگیان داوەتەوە، هەوڵیاندا بناخەیەکی گەردوونیش بۆ بەستنەوەی دەسەڵاتی شەرعی و هێز لەسەر ئەم خاکە دابنێن.

راستییەکەی، ئەم ئایدیایەی کە دبێژە خواوەندان خۆیان، لە قۆناخە کەم ئاڵۆزترەکانی بەرایی ئایینانەدا، بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان پێویستیان بەبەکارهێنانی هێز هەبووە، دیاریدەیەکی باو بووە. کەس لە بروسکەکانی خوداوەندە "زفس" Zeus ((زیۆس))ی یۆنانی، هەروەکو خوێنەرانی شیعرەکانی هۆمیرۆس Homer (سەدەی هەشت یان نۆی بەر لە زایین، خاوەنی هەردوو داستانی ئەلیادە و ئۆدیسە) دێتەوە بیریان، قورتاری نەبووە — جا چ خواوەندێ بوایە لە خواوەندەکانی ئۆلمپ، یان بنیادەمێکی فانی — ئەگەر گالتەی بە فرمانەکانی ئەو بکردایە، یان بەم یان بەو شێوەیە رکی زیۆسی بکردبایەوە. وەلێ ئێمە ئەفسانە کۆنەکانی وڵاتی نێوان دوو رووبارمان بۆیە هەڵبژارد، هەرچەند ئەو

ئەفسانانە باویش نین، تا جەخت لەسەر ئەم رووکارە لە رووکارەکانی فیکری مرۆیی بکەینەوە. چونکە ئەم ئەفسانانە بە شێوەیەکی دەگمەن هەردوو توخمی دەسەڵات و هێز خویا دەکەن کە بەبێ ئەو دووانە هیچ نیزامێك، چ خودایی بێ یان مرۆیی، خۆی لەسەر پێ ناگرێ. لێرە بەدواوە، لە چوارچێوەی تیوری قانوونیی، بە درێژتر لەم دوو چەمکە، دەدوێین.

## دەسەڵات

بیرۆکەی قانوون، لە بیرۆکەی بەرفەرمانبوون هەراوترە. لێ توخمی ملدانەواندن، توخمێکی یەکلاکەرەوەیە. دەبێ ئێمە ئەم جۆرە بەرفەرمانبوونە کە خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی پێوەندیی قانوونیی، لە شتی تر جیا بکەینەوە. دیقەت بفەرموون لە کردەوەیەکی چەکدارانەی دەسگرتن بەسەر بانکێکدا، قوربانییان هەرچییان لێ داوا بکرێ بلەز فەرمانەکانی باندە چەکدارەکە جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەم گوێڕایەڵییە هیچ پێوەندییەکی بە ملکەچکردنی رەعیەت بۆ ئاغا دەرەبەگەکەی نییە، یان بە ملکەچکردنی هاووڵاتی بۆ فەرمانەکانی ئەفسەرێکی پۆلیس، یان بە ملکەچکردنی داواکار کە دادخوازییەکەی بە قازانج و بەدڵی ئەو تەواو نەبووە. ئەم بەراوردە، تەنیا بەراوردێکی رووت نییە لە نێوان حەزکردن و حەزنەکردن لە بەگوێکردن. چونکە جۆتکار و هاووڵات و داواکار رەنگە هەر هەموویان لە ملکەچکردن بۆ دەسەڵاتێکی باڵاتر لە خۆیان دوودڵ بن چ لە سات و کاتی خۆیدا و چ لە دۆخێکی گشتگیرتردا. هەروەکو رەوشی کارمەندانی بانکی تایین، کە شتە گرانبەها و بەنرخەکان بە پەلاماردەران دەدەن.

بیرۆکەی دەسەڵات، وا دەخوازێت کەسێکی دیاریکراو کە مل بۆ کەسێکی دی کەچ بکا، بەبێ رەچاوکردنی ئەوەی کە داخوا ئەو کەسە، قانوون، یان فەرمانەکەی پێ



پەسند و راستە یان نا. هەڵبەت ئەو کەسەی کە دەبێ ملی بۆ دابنەوێندرێ، مەرج نییە تاکەکەسێك بێ هەروەکو لە پاشایەتی رەهادا وایە، بەڵکە ئەگەری ئەوەش هەیە کە سیستەمێکی کۆمەلایەتیی قەوارە بان سروشت بێت، یان سازمانێکی مرۆیی بە کۆمەڵ بێ وەکو شاژن لە پەرلەمانی بەریتانیا، یان کۆنگرێس لە ئەمریکا. لێرەدا تەنیا باسمان لەو کەسەیە کە دەبێ مل بۆ فەرمانەکانی دابنەوێندرێ.

کاتێ کە ئەو دۆخانەمان بەرچاوگرتن، بۆمان خویا دەبێ کە جۆتکار، ئاغاکەی بەو کەسە دەزانێ کە دەبێ ملی بۆ دابنەوێنێ. هەروا هاووڵات، ئەفسەری پۆلیس بە کەسی خوازراو دەزانێ کە دەبێ گوێڕایەڵی بێت، هەمان شت سەبارەت بە داواکار و دادوەرەوە. لەم بارانەدا، دەبینین رەوشێکی تەماوی دەوری هەر یەك لە ئاغا و ئەفسەر و دادوەرەکەی داوە، کە کاردانەوە، یان بەپیرەوەهاتن و دەنگدانەوەیەك لە دەروونی دەستەی دووەمدا دەگورێنێ، هەستێکی وا باڵ بەسەر ئەو دەستەیەدا دەکێشێ کە دەستەی یەکەم لەو بالاتر و بەشکۆترن. هەر بەم سیفەتەشەوە، دەستەی یەکەم فەرمان دەدەن، دەستەی خوارتریش هەست بە پابەندبوون و ملدانەواندن دەکەن جا پێیان خۆش بێت یان نا. ئەم هەستی پێڕەولێکردنە رەوایە، گرنگییەکی مەزنی لە قانووندا هەیە و روونکردنەوەی زێتری گەرەکە.

بۆ دەبێ کەسێك بە جۆرێ هەست بکا کە پابەندە بە داننان بە دەسەڵاتی یەکێکی تر و ئیدی بەناچاری فەرمانەکانی ئەو کەسە جێبەجێ بکا؟ بە شێوەیەکی تر، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە داسەپاوە، یان گریمان داسەپاوە بەسەر لایەنی ملکەچکەردا لە کوێوەیە؟

وەلامی پرەنسیپئامێزی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئەم پابەندبوونە، لە بنەڕەتدا، پابەندبوونێکی ئەدەبییە، بەو مانایەی کە کابرای گوێڕایەڵ بەکردەوە هەست بەوە دەکا، کە ئەو لە بەردەم ئەرکێکی ئەدەبیی ملدانەواندن دایە بۆ فەرمانەکانی ئاغا،

یان پۆلیس، یان دادوەر بەپێی کاودانی بەرهەست. ئەم چەمکە ئەدەبی، یان مۆراڵییە و پێوەندیی ئەو بە قانوونەوە، چەندین ئاریشە و سەختی تێدایە کە دەبێ دواتر پێیاندا بچینەوە. شایانی گوتنە لەمبارەوە پێوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان بیرۆکەی دەسەڵاتی شەرعی کە دەبێ بەهۆی ڕەوابوونیەوە ملی بۆ دابنەوێندرێ و بیرۆکەی پابەندبوونی ئەدەبیدا هەیە. ئەم پێوەندییە، بنەماو ڕێسایەك دەسەپێنێت کە داوای خۆبەستنەوەی ئارەزوومەندانە بە حوکمی ڕاست و دروستی ڕێساکە، دەخوازێ. هەردوو بیرۆکەی سەرەوە پابەندکارن لە ڕێگەی ئەوەوە کە ئەرکی گوێڕایەڵییان بەبێ هێز بەکارهێنان، گرتووەتەخۆ. ئا لێرەوە، هەست بەوە دەکرێ کە ئەوە ئەرکێکی ئەدەبییە، گوێڕایەڵیی قانوون بکرێ بەو مانایەی کە قانوون، نوێنەرایەتی دەسەڵاتێکی شەرعیی دەکات.

وەلێ مەترسی گەورەش لە هەراوکردنی ئەم وتووێژەدا هەیە. لەوانەیە بڕوایەکی چەوت لەمە بکەوێتەوە کە شەرعیەت و ڕەوشت دەشێ ببنە هاوشانی یەکتر. هەندێ کۆمەڵگا بەم دەرەنجامە گەیشتوون. مافی خوایی پاشایان بووە مایەی ئەوە کە پاشا بە مەعسووم لە هەڵەو چەوتی دابندرێ. دواتر کە بە درێژی باسی پێوەندیی نیوان قانوون و ڕەوشت دەکەین، دەبینین هۆی بەهێز هەن بۆ تووڕدانی ئەم بیرۆکەیە و دان بەوەنان کە بواری هەر یەك لە دەسەڵاتی شەرعی و دەسەڵاتی ئەدەبی، وێڕای ئاوێتەبوونی توندوتۆڵی ئەم دووانە، دوو بواری لێکجودا و بەجیا هەڵکەوتوون. لەسەرینی ئەمەوە، ئەوەی لێرەدا پێی لەسەر دادەگرین ئەوەیە کە بیرۆکەی ئەو دەسەڵاتەی دەدان بە ڕەوایی بوونی دانراوە، زۆرێك لە هێز و شنگی خۆی لە پێوەندیی بە پابەندبوونی ئەدەبییەوە وەردەگرێ. ئا ئەمە ڕەوش و دۆخی شۆڕشانە دژی دەسەڵاتی ئارا، کاتێ کە شۆڕشگێران هەوڵدەدەن کێشەی خۆیان پتەو بکەن و بەهەر هۆیەك بێ بیسەلمێنن کە دەسەڵاتی ئارا ناڕەوایە و حوکمڕانان هیچ پاکانەیەکی قانوونی، یان مۆراڵییان بەدەستەوە نییە بۆ بەرفەرمانبوون. ئەم



وتووێژە بە تایبەتی لە هەردوو سەدەی شازدە و حەڤدە بڵاو بۆوە. ئەو دەمە حکوومەت وەکو دامەزراوێك کە بەپێی کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی سازکرابێ، چاوی لێ دەکرا. ئەگەر فەرمانڕەوا ئەم پەیمانەی نەگەیاندبایە جێ، هەروەکو جیمسی دووەم، ئەوا ڕەعیەت پابەند نەدەبوون مل بۆ دەسەڵاتی ئەو، کەچ بکەن.

## کاریزما Charisma

خاسترین شرۆڤەیەك لەبارەی ئەو میتۆدانەی کە دەسەڵات بەسایەیانەوە لە کۆمەڵگەی مرۆییدا خۆی دادەمەزرێنێ، ئەو شرۆڤەیەیە کە کۆمەڵناسی ئەڵمانی (ماکس ڤیبەر Max Weber ۱۹۲۰ مردووە) کردوویە. دەسەڵات، یان کۆنترۆڵی شەرعیی، هەروەکو ڤیبەر وەسفی دەکا، یەکێ لەم سێ شێوەیەی خوارەوە دەگرێتەخۆ: ۱- بەهرەی خودایی، ۲- داب و نەریت، ۳- قانوون.

وشەی بەهرە ((کاریزما)) وشەیەکی گریکییە و بەمانای ((ناز و نیعمەت)) دێت. مەبەستی ڤیبەر لەم وشەیە ئەو هەیبەت و شان و شکۆ تایبەتییە تاکەکەسییەیە کە دەشێ مرۆ لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا پێی بگات. ئەم شان و شکۆیە خەرمانەیەکی شەرعیی بێ ئەملا و ئەولا، بەدەوری هەموو ڕەوتار و کار و کردەکانی ئەو مرۆیە دروست دەکا، زۆر جاران ئەم بارە لە ئاکامی سەرکەوتنێکی سەربازی دروست دەبێ. ئەسکەندەری گەورە و ناپلیۆن نموونەگەلی لەم بابەتە بوون.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا نموونەی لە فەرمانڕەوایی کاریزمایی بەشێوەی دیکتاتۆرئاسامان بینی لە بابەتی هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین کە هیچ بوار و دەرفەتێك بۆ گومان سەبارەت بە واقیعیبوونی ئەم شێوەیە لە شێوەکانی دەسەڵات ناهێڵێتەوە بەلەبەرچاوگرتنی ئەو شەقڵ و مۆرکەی لە سایەی سەردەمی تەکنەلۆجیای مۆدێرندا بەخۆیەوە دەگرێت. ئێمە هەر تەنیا وێنەیەکی ڕاستگۆی

ئەو کاریگەرییە موگناتیسییە نابینین کە هەندێ لە تاکەکەسان بەسەر شوێنکەوتوانی خۆیانەوەیان هەبووە، بەڵکە کاریگەریشیان بەسەر چەندین نەتەوە بەبتوونی هەبووە. مینا ئەو وێنە جوانەی پرۆفیسۆر *((تریفۆر ریپۆر* Trivor_Ripor*))* لەبارەی دوا رۆژەکانی هیتلەر کێشاویە کە لە ژوورە قایمەکەی خۆیدا کەلەلا کەوتبوو، لەگەڵ ئەوەیشدا فەرمانگەلی شێتانەی ئەوتۆی دەردەکردن کە کەس زاتی ئەوەی نەبووە لە روویدا هەڵگەڕێتەوە.

## باڵادەستیی داب و نەریت

دەشێ ئەو بەهرەیەی کە مرۆڤ هەیەتی کلیلێك بێت بۆ حاڵێبوون لە پرەنسیپی شەرعییەت. ئەو ژی لەبەر پێداگرتنێکی زۆر لەسەر ئەو هێزە دەروونیانەی کە ئەم چەمکە پێکدەهێنن. وەلێ خاڵی گرنگ ئەوەیە لە کاتێکدا رەنگە بەهرە، ئەو دەسەڵاتە بهێنێتە ئاراوە و بگورێنێ کە پاڵ بەسام و شکۆی کەسایەتیی پێشەوای تازە بدا، ئەمە سەرەڕای بوونی مەیل و خولیایەکی سروشتکرد بە ئاراستەی کوژاندنەوەی ژیلەمۆی ئەم سام و شکۆیە لە دوای مردنی پێشەوای تایین. بەڵام وا ناکەوێتەوە کە بەشێوەیەکی حەتمی ئەو بەهرەیە بە کەسایەتیی پێشەواکەوە بەندە، هەروەکو ڤیبەر ئاماژەی بۆ دەکا، ئەو دەسەڵاتە لە بنەچەکەدا سەرچاوەکەی کەسایەتیی سەرکردەکەیە، کە رەنگە بۆ وەچەی دوای ئەویش بگوازرێتەوە وەلێ بەشێوەیەکی کزتر. دەشێ تێبینی ئەم دیاریدەیە لە هەندێ پاشانشینی تازەشدا بکرێ، کە جێنشینەکانی سەرکردەی دامەزرێنەری ماڵباتی حوکمڕان، دەسەڵاتی شەرعیی خۆیان لە کەسی پێش خۆیانەوە وەردەگرن، وێڕای ئەوەی کە رەنگە هەندێ، یان گشت خەسڵەتەکانی پێشەوایە دامەزرێنەرەکەیان تێدا نەبێ. دەشێ تێبینی هەمان شت لە کایەی تری نا- سیاسیشدا بکرێ. دامەزرێنەرانی



ئایینەکان، سیفەتی بەهرەدارییان تێدا بووە. وشە و پەیڤەکانیان، کاریگەریی فەرمان و دەسەڵاتیان هەبووە و دوای مردنیشیان لەوانەیە پێڕەوانیان بشێن ئەم دەسەڵاتە بپارێزن و ئاقارەکەی فرەوانتر بکەن، تەنانەت ئەگەر بەهرەیەکی کەمیشیان لەچاو بەهرەی دامەزرێنەرەکە هەبێ کە هژموونی بەسەر شوێنکەوتووانیەوە هەبووە، ئەگەر ئەم بارە بۆ ماوەیەك بەردەوام ببێ، ئەوا ئەم بەهرە رەسەنە لە چوارچێوەی دامەزراوەیەکدا خۆی دەبینێتەوە، واتە لە چەشنێ لە دامەزراوەی هەمیشەیی کە قەرزارباری داب و نەریت و خو و خدەیە، خۆ دەنوێنێ.

نموونەیەکی ئاشکرای ئەم جۆرە " لە قاڵبدانی دامەزراوە"ییە، پاشایەتییە لە سیستەم یان کۆمەڵگەی فیۆدالیدا، چونکە هێشتا بەهرە بوونی هەبووە، بەڵام زۆر بە پاشا خۆی نەبەستراوەتەوە هەندەی بە سیستەمی پاشایەتییەوە بەند بووە، یان بە تاجەوە هەروەکو لە بەجێهێنانی دەستووریی بەریتانیدا دەگوترێ. چونکە فەرمانڕەواییکردن هەر تاکەکەسییە، بەو مانایەی کە پاشا تا رادەیەکی فرەوان دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی بە دەستەوەیە و بەشێوەیەکی رەواش پراکتیزەی دەکا، وەلێ مۆرکی دامەزراوەی پاشایەتی، کۆمەڵێ خو و خدەی نەریتخوازانەی گوراندووە کە بە پابەندکار بەئەژمار دێن. تا بەم شێوەیە سنوور بۆ ئازادیی رەوتاری ئەو کەسەی لەسەر تەختی پاشایەتی رونیشتووە، دادەنرێ. ئەم چەمکە بە باشترین شێوە لەو دەستەواژە نامێیەی *((برکتۆن* Bracton*))* خۆ دەنوێنێت کە گوتویەتی: دەبێ پاشا لە خوارەوەی خوا و قانوون بێت.

## باڵادەستیی شەرعی

ئەو جۆرە باڵادەستییەی کە ڤیبەر بە "داب و نەریت"ی ناو دەبا، تێکەڵەیەکە لە توخمگەلی کەسایەتی و قانوونی و دەشێ وردە- وردە گەشە بکا و شێوەیەکی

پەرەگرتووتر وەربگرێ کە ڤیبەر ناوی " باڵادەستیی شەرعیی" لێناوە. ئەم وشەیە، مرۆ خاپێنە، چونکە وای دادەنێت کە قانوون بە مانای وردی خۆی، لە دوا شێوەی دەسەڵاتدا هەیە، کەچی مەسەلەکە وانییە و ڤیبەر خۆیشی مەبەستی ئەوە نەبووە. تەنانەت لە سایەی فەرمانڕەوایی "کاریزما"ی رووتیشدا، لەبەر نەبوونی بنەماگەلێکی قانوونی هیچ هۆیەك نییە بۆ بەڕەوا دانانیان، تەنانەت ئەگەر مانەوە و بوونی ئەو بنەمایانەش پشت بە خواست و ویستی سەرکردەی کاریزمایی ببەستن. لەمبارەوە دەکرێ ئەوە بهێنینەوە یاد کە کۆکردنەوەی قانوونی رۆمانی لە لایەن جۆستنیان -ەوە کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر پەرەسەندنی قانوونی ئەورووپیی مۆدێرندا هەبووە، ئەمە لەسایەی سیستەمێك بووە کە بڕوای بەو بنەما دەستوورییە هەبووە کە دەڵێ: خواست و ویستی ئیمپراتۆر بۆ خۆی قانوونە. هەروا سیستەمی کۆنباوی فەرمانڕەوایش بەبێ بنەماگەلێکی قانوونی نەبووە، با ئەو بنەماگەلە رووخسارێکی عورفی نەك قانوونرێژییان پێوە دیار بووبێ. مەبەستی ڤیبەر لە پێداگرتن لەسەر بەکارهێنانی وشەی "قانوونی" بەتایبەتی لە شێوەی سێیەمی شێوەکانی کۆنترۆڵ، ئەوەیە کە لە سایەی ئەم سیستەمەدا، کۆنترۆڵی شەرعیی، چی دی تاکەکەسی نییە، واتە پێوەندیی بە تاکەکەس نەماوە و رووخساری دەسەڵات تا رادەیەکی گەورە، ئەگەر بە تەواویش نەبێت، رووخساری دامەزراوەیی وەرگرتووە و دامەزراوە جێگەی دەسەڵاتی تاکەکەسی گرتووەتەوە.

بۆ نموونە دەوڵەتی دیموکراتیی مۆدێرن، وازی لە دەسەڵاتی کاریزمایی بۆ بەرژەوەندی دامەزراوەی قانووندانان و بیرۆکراسیی و دادوەری کە بەبێ ئەم و ئەو لەسایەی سیستەمێکی قانوونی کە رەوایی بەکارهێنانی هێزی پاوانکردووە کاری خۆی دەکا.



لەم بارەدا، کۆنترۆڵی قانوونیی، کاریزمای کەسایەتی دەخاتە ئەو لاوە، لێ هەر بڕوای بەرەوابوونی هەیە. چونکە بەبێ ئەم بڕوابوونە بێ ئەملاو ئەولایە، دەسەڵاتی قانوونیی نا- کەسی و خودی لەکار دەوەستێ و بشێوی و بێ سەرو بەری جێگەی دەگرێتەوە.

شایانی گوتنە، ئەم بڕوابوونە بە شەرعییەت، کە بنەمای کاری دەوڵەتی مۆدێرنە، هەروەکو ئیمپراتۆریای شارلمان، بڕوابوونێکی لۆجیکی نەبووە بەو مانایەی کە بشێ بە پێوەرگەلی لۆجیك پاساو بدرێتەوە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە دەبێ لە زەین و بیری خۆماندا ئاگامان لەوە هەبێ کە بڕوابوون بە رەوایی کۆنترۆڵی قانوونیی وتووێژێکی نەبڕاوەی لەخۆ گرتووە. قانوونگەل، هەروەکو پێمان گوتراوە، ئەگەر دارێژران رەوا دەبن. داڕشتنی قانوونیش ئەو دەمە رەوا دەبێ ئەگەر دەست بەو بنەماگەلەوە گیرا کە ئەو کارڕاییانەی دەبێ پێڕەوییان لێ بکرێ روونکەنەوە. پێمانوانییە پێویستمان بەوە هەبێ کە وەکو چۆن ڤیبەر پێیوابووە، ئێمەش پێمانوابێ کە دەیگوت: ئەم پیلەکە نەبڕاوەیە خۆی مەبەستدارە تا ئەو بڕوایە بە شەرعیەتێکی بەری لە هەر ئایدیالێکی تایبەت و بڕیارگەلێکی نرخئاسا، دروست بکەین. ئەو راستییەی کە بە چاکی ددانی پێدا دەهێندرێ ئەوەیە: کە کۆمەڵگەی مرۆیی پشت بە بڕوای ئەقڵانی، یان نا ئەقڵانی دەبەستێ، وەلێ پێویستی بەوە هەیە کە ئەم بڕوایانە روون و ئاشکرا و مەفهوم بن لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا. قانوونزانە هاوچەرخەکان زۆر گرنگیان بە دانان یان روونکردنەوەی داڕشتەیەکی رەها داوە کە ببێتە بناخەیەکی پێویست، یان لۆجیکی بۆ کۆنترۆڵی قانوونیی لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، یان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. ئەم پرسە لە جێگەی لەبار و گونجاوی خۆیدا باس دەکەین. لێرەدا تەنیا ئەو قسەیە دەکەین کە دەسەڵات بە مانا فرەوانەکەی، بەتایبەت بە مانا قانوونییەکەی، پشت بە بڕوابوونێکی بێ ئەم لاو ئەولا بە شەرعییبوونی خۆی دەبەستێ.

تا گومانمان بۆ ئەوە نەچێ کە شرۆڤەکاریی ڤیبەر ورد و قایم بە شێوەیەك کە بکرێ بەسەر دۆخی مێژوویی هەر کۆمەڵگەیەکی ئارای پراکتیزە بکەین، ئێمە دەمانەوێ دووپاتی بکەینەوە کە ڤیبەر خۆی هەندە گرنگیی بە پەرەسەندنی مێژوویی نەداوە، هەندەی گرنگی بە لێدانی بناخەیەك داوە کە وەکو ناوی لێناوە "نموونەگەلی ئایدیالی" کە پەرەسەندنی تەواوی ئەگەرە رەگئاژۆکانی ناو هەندێ جۆرە رێکخستنی کۆمەڵایەتی دەردەبڕن. ئەم نموونەگەلە ئایدیالی نین بە مانا ئاکارییەکەی، یان ئەفلاتوونییەکەی، بەڵکە سادەکردنەوەیەکە بنیادێکی شیکاری دەرەخسێنێ کە دەکرێ لیتۆژینەوەی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەکەیدا ئاراستە بکرێ. شیکردنەوەکە لێرەدا نموونەییە Typological نەك گەشەکاری Developmental. چونکە کۆمەڵناسیی لە روانگەی ڤیبەرەوە تەنیا گرنگی بە ئاراستە گشتییەکان دەدا. بۆ نمونە، چۆنیەتی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی رۆژئاوایی لە باری مێژووییەوە، بەرپرسیارێتیی لێتۆژەری مێژوویی نییە، بەڵکە بەرپرسیارەتی مێژوونووسە. ڤیبەر دان بەوە دادەنێ کە نموونەگەلە ئایدیالەکانی بەم شێوەیە لە مێژوودا روو نادەن، بەڵکە هەمیشە تێکەڵن بە پێکهاتەی گۆڕاو لە رووی پلەی ئاڵۆزی و پێکهاتنیانەوە. با نموونەیەکی ئەمە وەربگرین، ئەڵمانیای نازی تا رادەیەکی بەرچاو بە بیچم و چارەی کاریزمای کەسایەتییەوە بەندبوو، هەروا بە بیچم و چارەی بیرۆکراسیی مۆدێردنی پێوەندداریشەوە بە کۆنترۆڵی قانوونیی. شیکردنەوەیەکی لەم بابەتە، بەشداری لە تێگەیشتنی ئەو لقە جیا- جیایانە دەکا کە قەوارەی قانوونیی هەر کۆمەڵگەیەك پێکدهێنن، هەروا سروشتی گشتیی ئەو دەسەڵاتەش کە بەشێوەیەکی حەتمی یەکێ لە کۆڵەگە سەرەکییەکانی پێکدەهێنێ.



## هێـز

بەشێوەیەکی گشتی باسمان لەو توخمەی پێویستەی دەسەڵاتی شەرعی کرد تا قانوون بکارێ فەرمان و ئەرکی خۆی لە هەر کۆمەڵگەیەکدا ببینێ –واتە رۆڵی ئانو لە ئەفسانەی وڵاتی میزۆپۆتامیا- ئێستاش پێویستە شتێکیش لەمەڕ هاوتاکەی "هێز" بڵێین کە بەرجەستە بووە لەم ئەفسانەیەدا: واتە "ئینلیل"ی خوداوەندی باهۆز.

دەشێ هەوەڵجار قسە لەبارەی پێوەندیی هێز بە دەسەڵاتەوە بکەین، ئەو ژی بە سەرنجدان لەو کۆمەڵگایانەی کە بەشێوەیەکی کاراو تەواو کۆنترۆڵ کراون بەبێ ئەوەی کە رەعیەت هیچ بڕوایەکیان بە رەوایی بوونی ئەم کۆنترۆڵکردنە هەبێ. ئەمە بەناچاری لە هەموو کۆمەڵگایەکاندا وا نەبووە، نەمازە لەو کۆمەڵگایانەی کە دانیشتوانیان لە رەعیەت یان کۆیلە پێکهاتبوون وەکو سپارتای کۆن یان ئیمپراتۆریای رۆم کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کۆیلە بوون. چونکە تەنانەت لەم کۆمەڵگایانەشدا، وێڕای ئەو کولەمەرگی و دەردەسەریەی کە هەبووە، ئەوا رەوایبوونی ئەو دەسەڵاتەی کە دەوڵەت پراکتیزەی کردووە، جێگەی باوەڕی دانیشتوان سەرلەبەر بووە.

هەرچەند دەشێ کۆمەڵگەی واش هەبووبێ کە لە بشێوی و ئاژاوەدا نەژیێ، لێ زۆرینەی دانیشتوان باوەڕیان بە رەوایی ئەو دەسەڵاتە نەبووە کە کۆنترۆڵی کردوون. نموونەی ئەمەش، لە شەڕی دووەمی جیهاندا، هێزەکانی نازی چەند وڵاتێکی ئەوروپاییان داگیر کرد بوو و هێندەش هێزیان هەبوو کە ویست و خواستی خۆیان بەسەر دانیشتوانەکانیاندا بسەپێنن. لێ دانیشتوانی وڵاتە داگیرکراوەکان رەوایبوونی دەسەڵاتی داگیرکەرە نازییەکانیان رەتکردەوە. راستە ئەم رەوشە، رەوشێکی کاتەکی بوو، ئەگەر نازییەکان لەشەڕدا سەربکەوتبانایە لەوانەبوو باوەڕ بە رەواییبوونی فەرمانڕوایی خۆیان خەلق بکەن هەروەکو چۆن نۆرماندییەکان، پەلاماری بەریتانیایان

داو بەسەر ئەنگلۆ- ساکسۆنەکاندا سەرکەوتن. گومان لەوە دەکرێ کە داخوا بەراست تا چەند بەپشبەستن بە هێزی زەبروزەنگ و ترسەوە، بەبێ بوونی توخمی شەرعییەت، دەشێ دەسەڵات و کۆنترۆڵ بپارێزرێ، با لە هەندێ هەلومەرجی ناوازەو تایبەت و بۆ ماوەگەلێکی کورتخایەن هێز توانیبێتی ئەمە بهێنێتەدی.

داخوا ئەمە بەو مانایەیە کە لەدوامەنزلدا، قانوون تەنیا بە پێوەری هێز راڤە دەکرێ؟ و هەروەکو لەسەر زاری "تراسیماخوس Thrasymachus" لە کتێبی "کۆمار"ی ئەفلاتوون داهاتووە کە لە بارەی داد-ەوە دەدوێ و دەڵێ قانوون برێتیە لە "بڕیاری هەرەبەهێزەکە" داخوا راستە قانوون تەنیا برێتییە لە کۆمەڵێ بڕیار و بنەمای داسەپاو بەزۆر؟

لەمبارەوە چەندین دژە-بۆچوون لەئارادا هەن، لە هەمووان لۆجیکتر و بەڵگەبەهێزتر ئەو بۆچوونەیە کە دبێژە: بەڵگەهێنانەوەی ئەم تێڕوانینە بە رەوشی هێزە داگیرکارە نازییەکان، هەوڵدانێکە بۆ بەزۆر لەقالبدانی قانوون لە شێوەیەکی پەراوێزکەوتوو و رەوشێکی ناوازەدا لەجیاتی حاڵیبوون لە قانوون لە شێوە بەجیاهەڵکەوتووەکەیدا. راستە هەندێك گوتیان کە ئەو رێساو بڕیارانەی لە هەلومەرجی داگیرکاریی نازیدا سەپێندران، بنەمای ئاکارەکی یان شەرعییان نییە و ئەم بڕیارو رێسایانە هەرگیز ناگەنە ئاستی قانوون، بەڵکە بە بڕیارە داسەپاوەکانی چەتەو باندو رێکخراوە تیرۆریستییەکانی لەبابەتی مافیا لە سەقلیە دەچن. لێ ئەم پاساو و بەڵگەیە هەرچۆن بێ کە دواتر دەگەڕێینەوە سەری، لێرەدا هەر هەندە دەڵێین: لە ماوەگەلی شەڕ یان شۆرشدا — واتە ماوەگەلی ناوازە- دەکرێ کاتەکی بەهێزی زەبروزەنگ یان تەنیا بە تیرۆر و تۆقاندن فەرمانڕەوایی بەسەر کۆمەڵگەیەکدا بکرێ، بێگومان ئەمەش هۆیەکی بڕواپێهێن نییە کە قانوون تەنیا بەدەربڕی هێز بزاندرێ و بەس.



لە ئالەکا دی، داخوا دەشێ قانوون هزر بکرێ، بەلایەنی کەمەوە لە باری کردەنییەوە، بەبێ ئەوەی پشتئەستوور بێ بە هێزێکی کاراوە؟ راستە هێزی قانوون هەمیشە بەو بنەماو رێسایانەوە بەندە کە دەشێ بەزۆر بسەپێندرێن، چونکە جەللاد و زیندانەوان و دەرگەوان و پۆلیس، هەر هەموویان، بەشێکن لە دەزگای سیستەمی قانوونیی ئارا. ئەم تێڕوانینە باوە لەم دەستەواژەیەدا پوخت و چڕ بووەتەوە کە دادوەرێکی بەریتانی گوتویەتی: چاکترین تاقیکردنەوە کە داخوا ئەو کەسەی خۆی شێت کردووە، لە بەرانبەر ئاکارو کردەوەکانی خۆی بەرپرسە یان نا، داخوا ئەو کەسە دەستی بەدەست پۆلیسەوە بێت، هەمان کارو کردەوە دەکا.

قسەیەك کە لەبارەی مۆرکی زۆرەملێی قانوون، جێگەی بایەخ بێ، ئەوەیە کە مرۆڤی وا هەن کەس گومان لە دڵسۆزییان ناکات، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هێز یان توندوتیژی خۆی لە خۆیدا، چەوت و هەڵەیە، ئەو قانوونەی بە تەواوی پشت بە زەبروزەنگ ببەستێ، ئەوا پرەنسیپەکانی رەوشت و ئادابی هەقوێژ دەخاتە ژێر پێی خۆیەوە، ئەوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هێز برێتیە لە رەتکردنەوە یان وردوخاشکردنی قانوون و پەنا بۆ هێز بردن دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی قانوونەوە. واتە هێز توخمێکی لایدە و نامۆیە و هەر دەمێ حوکمی قانوون پەکی بکەوێ، ئەو دەمە پەنا بۆ هێز دەبردرێ.

مسۆگەر ئەم تاوتووێکردنە هەرچەند پاساوی خۆی هەبێ، ئەوا بشێوی لێدەکەوێتەوە و بەشدارییی لە تێگەیشتنی ئەرك و وەزیفەی قانوون ناکات، تەم تومانێکی چڕ دەخاتە سەر نیشانە گرنگەکانی قانوون کە بەبێ ئەوان ناشێ لە دەوری قانوون لە کۆمەڵگەی مرۆیی تێبگەین. هەندێ لە پشتەوانانی ئەم دیدگایە دەڵێن تاکە قانوون کە ئەوان وەکو قانوونێکی راستەقینە ددانی پێدا بنێن، قانوونیی رەوشتە، ئەم قانوونە خۆی لە هەموو شێوەکانی زۆرلێکردن بەدوور دەگرێ و بە تەنیا پەنا بۆ ویژدانی مرۆڤایەتیی خۆی دەبا. تاوتوێکردنێکی لەمبابەتە، تاوتوێکردنێکی رووتی

بەقسەیە بەو مانایەی کە دەبێ هەموو پێناسەیەکی قانوون رەتبکەینەوە ئەگەر پێچەوانەی ئەو پێناسەیە بێ کە تەنیا قانوونیی رەوشت بگرێتەوە وەکو بنەمایەك بۆ بڕیاری ویژدان نەك بڕیاری هێز یان هەر شتێکی تر کە وەکو سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی رەوشت پەنای بۆ ببردرێ. تێڕوانینێکی بنەڕەتی دیش هەیە کە پێی وایە ناشێ سیفەتی قانوون بدەینە پاڵ هەر سیستەمێکی قانوونیی ئەگەر ئەو سیستەمە لەگەڵ قانوونی ئاکارەکی گونجاو نەبێ یان بەلایەنی کەمەوە نەخرێتە ناو چوارچێوەی بنەمای رەوشتەوە، ئەو کەسانەی پیلەکان دەکەن و دەڵێن هێز پێچەوانەی قانوونە، ناچارن هەنگاوێکی تر هەڵبێننەوە و بڕیار بدەن کە قانوونی ئاکارەکی، زەبروزەنگ دەخاتە ئەملاوە، لێ راستییەکەی ئامانجی ئەم تەرزە گفتوگۆیە دروستکردنی جۆرێکی تایبەتیی پێوەندییە لەنێوان قانوون و رەوشتدا، بەم شێوەیە دەوری هێز لە سیستەمی قانوونیی دەبێتە پرسێکی لاوەکی، لاوەکییە نەك لەبەر ئەوەی دەوری هێز بەشێوەیەکی رێژەیی گرنگ نییە، بەڵکە لە رووی تەکنیکییەوە لاوەکییە. بەپلەی یەکەم گرنگ ئەوەیە کە روونی بکەینەوە داخوا قانوون پێوەندییەکی دیاریکراوی بە رەوشتەوە هەیە، کەنگینێ توانرا بەسەر ئەو ئاستەنگەدا زاڵ ببین، ئەوا پرسیارێکی تر لەبارەی ناوەڕۆکی ئاکارەکیی وەکو قانوونێکی کاریگەر دێتە پێشەوە، کە داخوا ئەم ناوەڕۆکە زەبروزەنگ بەکارهێنان دەگرێتەوە یان نا. ئەم پرسە دواتر لە فەسڵی پێوەندی قانوون بە رەوشتەوە باس دەکەین و روونی دەکەینەوە کە کۆسپێکی زۆر لەبەردەم ئەوانەدا قوت دەبنەوە کە دەیانەوێ هاوبەندییەکی پێویست لە نێوان ئەو دووانەدا دروست بکەن، تەنانەت ئەگەر بکرێ هاوبەندییەکی لەمبابەتەش دروست بکرێ، ئەوا سەرئێشە و زەحمەتییەکی زۆرتر دێتە رێگەی هەر هەوڵ و کۆششێك بۆ دیاریکردنی ناوەڕۆکی پێویستی رەوشت دەرهەق بە نا- توندوتیژی و شتی تر.

تەنیا ئاکارویستان نین کە بەرهەڵستی رووە زەبروزەنگەکەی قانوون دەکەن. تەوژمێك هەیە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێداگرتن لەسەر زەبروزەنگ لە



جێبەجێکردنی قانووندا، بەدحاڵیبوونە لە دەوری زۆرکردن. خەڵك گوێڕایەڵی قانوونن نەك لەبەر ئەوەی بە زەبری هێز ناچارکراون بەڵکە بەلایەنی کەمەوە پەسندی دەکەن یان ملی بۆ دادەنەوێنن، ئەم قایلبوونە، نەك بە هەڕەشەی هێز، وا دەکا سیستەمی قانوونیی کارا ببێ. جاران ئەم رایە بەند بوو بە ئایدیای کۆمەڵگە و بەو پێیەی قانوون لەسەر بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی رۆنراوە کە پشت بە پرەنسیپی پەسندکردنی ئازادانەی تاکەکان دەبەستێ، ئەوانەی رەزامەندییان لەسەر ئەو پەیمانە دەربڕیوە کە مل بۆ قانوون و حکوومەت دابنەوێنن. لێ ئەم شێوەیە لە شێوەگەلی پەسندکردن، تا رادەیەکی زۆر ئەگەر بەتەواویش نەبێ خەیاڵئامێزە. ئێستا را و بۆچوونی مۆدێرن باوەڕی بەم رازیبوونە نەماوە، وەلای ناوەو ئایدیای دەنگدانی گشتی و فەرمانڕەوایی زۆرینە لە کۆمەڵگە دیموکراتییەکاندا جێگەی گرتووەتەوە کە ناو بە ناو تاکەکەس پابەندبوونی خۆی بە سیستەمی فەرمانڕەوایی ئارا دەردەبڕێ. ئەگەر ئێمە ئەو پرسەمان لەملاوە دانا کە داخوا ئەم شێوازە بەئەندازەی ئەوەی تیوریی گرێبەستی کۆمەڵایەتی واهیمەیەکی تێدا پەنهان نییە، دەبینین ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە، هەوڵ نادا هێز لە سیستەمی قانوونیی دوور بخاتەوە، بەڵکە دەیەوێ تەکز بکاتە سەر ملکەچکردنی بەخورتی بۆ ملدانەواندنی ئارەزوومەندانە بگۆڕێ. بەمانایەکی وردتر، ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە ئامانجی ئەوەیە کە نیشانی بدا قانوون پشت بە بەبەکارهێنانی سەرکەوتووانەو رێکوپێکی هێز نابەستێ دەرهەق بەو رەعیەتانەی بەرەنگاری قانوون دەبنەوە یان سەرپێچی لە فەرمانەکانی دەکەن، بەڵکە لە دوا شیکردنەوەدا، لەسەر داد دامەزراوە، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە داخوا دەکرێ هێز لەدژی ئەو کەسانەی کە بنەماکانی قانوون پێشێل دەکەن بەکار بهێندرێ، یان نا. بەم شێوەیە پرسی زۆرلێکردنی قانوونیی بووە بە کارڕاییەکی بەرێککەوت نەك کارێکی جەوهەری و بنەڕەتی لە بوونی قانووندا.

## هێز لە قانوونی نێودەوڵەتیدا

دنیای هاوچەرخ لە بواری نێودەوڵەتیدا زێتر گرنگییەکی تایبەت بەم تێڕوانینە دەدا تا بواری نەتەوەیی یان نیشتمانیی. ئەو کەسانەی کە نکوڵی لە دەوری زۆرلێکردن لە جغز و بازنەی نەتەوەیی دەکەن، کەمن، لەگەڵ ئەوەیشدا، هی واش هەیە دبێژێ کە پێداگرتنی زیاد لە پێویست لەسەر هێز، داسەپاندنی شێوازی قانوونی سزایەکان بەسەر هەموو قانوونی نیشتمانیدا، دەگرێتەخۆ و بەم شێوەیە سروشتی راستەقینەی قانوون دەشێوێ. بەم زووانە، لەسەر ئاستی پێوەندیگەلی نێودەوڵەتی، سیسەمێکی قانوونیی پەیدا بووە کە وڵاتە شارستانییەکان خۆیان لەڕاستیدا، بەپابەندکار دەزانن، نەك بەزۆر بەسەردا سەپێندراو بێت چونکە هێزێکی رێکخراوی جیهانی نییە کە توانای پراکتیزەکردنی دەوری پۆلیس و ئێشکگرو وەردی هەبێ کە لە قانوونی نیشتمانیدا هەن. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەم بڕیار و حوکمگەلانە بە قانوونی نێودەوڵەتیی بەئەژمار دێن، گفتوگۆی گۆرین تەکز دەکاتە سەر پاساودانی ئەم رەوتارە، هەرچەندە زۆرلێکردنی نێودەوڵەتی هیچ شێوازێکی رێکخراوی نییە. ئەوەی جێگەی گالتەجارییە، هەندێ ناوەند تەنیا هەوڵ و کۆشش بەختکردن تا قانوونی نێودەوڵەتی کاراو پابەندکار بێت، بەوازهێنان لە قانوون بەقازانجی ئەو هێزە لێکدەدەنەوە کە نەتەوە یەکگرتووەکان پراکتیزەی دەکات. ئەم رەخنەیە ئەو دەمە نەتەوە یەکگرتووەکان هێزی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی هەردوو قەیرانی کەناڵی سویس و کۆنگۆی بەلجیکایی بەکارهێنا، سەری هەڵدا.

دەبینین بەرهەڵستکارانی زۆرلێکردن بەڕاست هەوڵدەدەن کارڕایی قانوونیی بەپێوانەی دەسەلات وەسف بکەن، ئەوژی بۆ پشتگوێخستن یان رەتکردنەوەی توخمی هێز. کەچی رووکاری زۆرلێکردن لە قانووندا بەو ئامانجەیە هێز لە پێشی پێشەوە دابنێ و خۆی لە دەسەلات نەبان بکات. ئەگەر ویستمان وێناکردنێکی هەمەگری قانوون وەدەست بێنین پێویستە ئێمە هەردوو بەڵگە رەچاو بکەین، هەرچەندە ئەمە



بەو مانایە نییە کە دەبێ خۆمان بە هەڵوێستێکی بێژەکی ببەستینەوە، چونکە هیچ چشتێك نییە بگاتە ئاستی قانوون مادامەکێ ئەو تشتە ئەم دوو توخمەی تێدا نییە، قانوون مینای رەوشت چەمکێکە تەواو ئیلاستیستی، هەروەکو دەبینین هەندێ رەوشی پەراوێزخراو هەن کە وا دەخوازێ و پێویست دەکا دەزگای قانوون بەکاربهێندرێ، تەنانەت ئەگەر هەندێ رووکار کە فیبەر لە نموونە ئایدیالییەکەیدا ناوی هێناون وجودیشیان نەبێ یان بەشێوەیەکی کزو پەڕپووت بوونیان هەبێ. رەنگە ئێمە هۆیەکی شایەن بایەخ وەبینین تا زۆرلێکردن وەکو رووکارێکی قانوون"نموونەیەکی ئایدیالی" دابنێین، لە کاتێکدا لەبەر هۆی دیکە، هەر ددان بەوە دەنێن کە قانوونی نێودەوڵەتی کە ئەم ناوەی لێنراوە، وێرای کە رێژەیەکی کەم لە زۆرلێکردنی سیستەماتیکی تا ئێستا ئەم نیزامە وەدیهێناوە. هەروا لە کۆمەڵگەی کەم پەرەسەندووتردا تێبینی ئەوە دەکرێ کە زۆرلێکردن شێوەی هێزێکی ناوەندیی دەوڵەت وەرناگرێ بەو ئەندازەیەی کە شێوەی پشتبەستنی هەر تاکێك بە خزم و کەس وکاری خۆی بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانی وەریدەگرێ. لە تێڕوانینێکی رووتی ئاکارەکییەوە، وێدەچێ تۆڵەساندنەوە پێچەوانەی قانوون بێت، لێ قانوونزان پێی وایە هۆکاری یەکلاکارەوە هەن کە وای لێ دەکات ئەم شێوازە ئاژاوەچێتییە بەروالەت لەناو چوارچێوەی زاراوەگەلی قانوونیی پۆلین بکات، هەرچەند دووریش بێت لە نموونەی ئایدیالیی قانوون کە بابەتی تیوریی زانستی قانوونە.

تیوریسینی قانوونیی وەك هەر کەسێکی تر کە بایەخ بە دیراساتی کۆمەڵایەتی دەدەن، بەپەرۆشی لێکدانەوەو راڤەکردنی ستراکتوری گشتی بواری تۆژینەوەیە، لەسۆنگەی ئەمەشەوە ئەو پێویستی بە دەزگایەکی پرەنسیپئاسا هەیە کە هێلکارییەکی دیاریکراوی بۆ ئامادە بکا کە بەهۆیەوە بتوانێت و لەچوارچێوەکەیدا دیاریدە جیا-جیاکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لێکبداتەوە و نرخیان بۆ دابنێت. ئەم جۆرە پۆلینکردنە کە فیبەر ناوی ناوە"نموونەی ئایدیالی" لە بنیادێکی یەکگرتووی

شیتەلکاری بترازێ شتێکی تر نییە. ئەم بنیادە ئەقڵگرە و لەم روونی و بێگەردییەی ئەم وێناکردنەدا، ناشێ لەهیچ شوینێکی وەدۆزین، چونکە خەیاڵئامێزە، گرنگی ئەوە لەوەدایە کە چەمکێکی سنووردارە و رەوش یان کرداری راستەقینەی پێ بەراورد دەکرێ.

پێویستە وەسا چاو لە زانستی قانوون بکرێ کە پرۆسەیەکی بەردەوامە و ئەو دەمە بەرجەستە دەبێ کە جێگە و رێگەی زۆرلێکردن لە قانوونی نێودەوڵەتی دەزانین. هەروەکو چۆن پلە پلەییەکی بێ سنووری هێز هەیە لە تۆڵەکردنەوەوە بگرە تا دادگاییکردن لەبەر ریزنەگرتن لەو بڕیارەی لە دادگەیەکی هاوچەرخ دەرچووە، هەروا دەبێ لە قانوونی نێودەوڵەتیش زنجیرەیەکی دوورودرێژی کاراییی جیا-جیا هەبێ کە لە هەر یەکێکیاندا شێوەیەك لە شێوەکانی زۆرلێکردن بەکار بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو زۆرلێکردنەی لەنێوان نەتەوەکاندا بەکار دێت، ناشێ وناکرێ لەگەڵ ئەو تەرزەی لە قانوونی دەوڵەتێکدا هەیە جووت بێ کە زۆرلێکردن بەسەر تاکەکاندا پەیڕەو دەکات. سروشتی ئاریشەکە جیایە، چونکە لێرەدا نەتەوەیەك بە بتوونی ملی پێ کەچ بکرێ، چونکە بەکارهێنانی رەهای هێز لەوانەیە ببێ بە لەناوبردنی ژیان و ماڵ و ملّك بەشێوەیەکی فراوان. راستە تەنانەت لەسەر ئاستی نەتەوەییش، قانوون دەخوازێ لە هەلومەرجی ئێستاشدا پراکتیزەی زۆرلێکردنی قانوونیی بەسەر کۆمەڵ و گرووپەکاندا سەرباری تاکەکان بکا کاتێ کەکاراییی سزاکاریی دەرهەق بە دامەزراوەی گەورە-گەورە پێڕەو دەکا کە قەوارەی دۆمێنەکانی بەقەد هەندێ دەوڵەتی سەربەخۆیە. لێ راستییەکەی ئەوەیە کە قانوونی نەتەوەیی بڕیارو ئەحکامەکانی بە زەبری هێز بەسەر تاکەکاندا- وەکو بەرێوەبەرانی دامەزراوەکان یان کارمەندەکانیان- پێڕەو دەکا و ماڵ و موڵکی دامەزراوەکە گل دەداتەوە یان دەستی بەسەردا دەگرێ هەروەکو چۆن ملّك و ماڵی تاکەکان زەوت دەکا. ئەم رەوتارە چونیەکە وێرای جیاوازی لە خاسیەت و مەوداوە، دەکرێ بەرە-بەرە لە



بواری نێودەوڵەتیشدا بێتەدی، ئەگەر چی ئەم پەرەسەندنە درێژخایەن و دژوار و لەیەك سەمت زێتری دەبێ. ئەوە دەبێتە ئەرکی زانستیی قانوون کە ئەم فۆرمۆڵانە دابرێژێ و وا چاکتریشە لەرێگەی جەختکردنەوە لەسەر پێناسەی قانوون ئەمە ئەنجام نەدا، کە پێویستی بە زۆرلێکردن دەکاتە مەرج یان نا، بەڵکە لەرێگەی جەختکردن و دووبارەجەختکردنەوە لەسەر دەوری شێوەکانی زۆرلێکردن و دەوری کاراییی زەبروزەنگئاسا لە پێوەندیگەلی قانوونیدا. لێوەکۆڵینێکی لەم جۆرە، کە بەرپاکردنی پێوەندیگەلی مرۆیی رەچاو کردبێ، لەوانەیە جەختکردنەوەی بەردەوام لەسەر نموونەگەل و چەمکگەلێك کە شیکردنەوەی قانوونیی زۆرلێکردن و پۆلینکردنی لەبەر رۆشنایی، لێبکەوێتەوە. بە دەستەواژەیەکی تر، تیوری قانوونی مۆدێرن، چارەسەری دینامیکی بە بزافتی دەوێ نەك چارەسەری ستاتیکی.

## داخوا دەکرێ دەستبەرداری هێز ببین؟

ئەم پرسیارە هەمیشە دێتەگۆڕێ: لەم سەردەمەی ئێستاماندا چ پاساوێك هەیە کە پشتی پێ بدەین بۆ پێداگرتن لەسەر دانانی توخمی زۆرلێکردن لە سیستەمی قانوونیی خۆماندا؟ دیتمان کە ئەم توخمە لە کایەی نێودەوڵەتیدا تۆزە دەورێك دەگێڕێ، تەنانەت لە قانوونی نیشتمانیشدا، خەڵك بۆیە مل بۆ قانوون دادەنەوێنن چونکە قانوون، قانوونە، نەك لەبەر ئەوەی ئەگەر لە قانوون هەڵگەڕانەوە خۆیان تووشی سزادان دەکەن. ئیدی ژ بەرچ ئەو هەموو پێداگرتنە لەسەر هێز کە بۆ زۆر کەس وەکو رواڵەتی زوڵم و زۆر دێتەبەرچاو تا رواڵەتی قانوون، کە دەکرێ بە هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی ئاکارەکیی قانوون خۆی دابندرێ؟ گرنگ ئەوە لە بیرو زەینی خۆماندا بەوە بزانین کە دەشێ لەو کاتەی تەرزو جۆری نموونەیی قانوونیی ئێمە هاوشێوە یان تەواو لەگەڵ قانوونی بەرکاری کۆمەڵگەیەکدا نەگونجێ، دەبێ

لەو توخمانە پێکبێت کە لەگەڵ تاقیکردنەوەی ئینسانیدا لەبارو ڕێکبێت دەنا ئەم تەرزو شێوەیە هیچ کەڵکێك و لە جێگەی خۆیدا نابێت، کەواتە تاقیکردنەوە چی نیشانداوە؟ نیشانیداوە کە قانوونی کۆمەڵگەی مرۆیی لە هەموو ئاستەکانی خۆیدا، بۆ کارایی خۆی پشتی بە مەوداو ئاقاری ئەو هێزە تەکوزەی بۆی دەگەڕێتەوە، دەبەستێ. ڕەنگە کۆمەڵگەی بەرایی ئەمە ڕەت بکاتەوە، کەچی زانستی نوێی ئیتنۆسەکان — هەروەکو دەبینین لە لێتۆژینەوەکەماندا بۆ قانوون کە سەرچاوەکەی عورف و بەندو باوە- ئەم رایە ڕەت دەکاتەوەو بەئاشکرا دەوری سزا لە چەندین کۆمەڵگەی بەرایی چ لە پێشان و چ لە ئێستا، نیشان دەدا، ئێمە کاتێ ئەو بێ سەروبەریە ڕێژەییەی لە کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتیدا هەیە و پشت بە خزمایەتی نێوان ئەو گروپ و دەستانە دەبەستێ لە دەوری ئاغا دەرەبەگەکانەوە بۆ داساپاندنی قانوونی خۆی، کۆبوونەتەوە، لەگەڵ ئەو بێ سەروبەرییەی لە دەزگای دەوڵەتێکی هاوچەرخی ناوەندیدا دەیبینین، بۆمان دەردەکەوێ کە دەسەڵاتی قانوون بە بوونی دەزگایەتی ئۆرگانیزەکراوی لەدەمدەرەوە، چی وەدەستهێناوە.

لێ ڕوونکردنەوەی دەوری زۆرلێکردن لە قانوونی مرۆییدا، لەوانەیە لە ئاستێکی قوڵتردا بێت. شیتەڵکاریی دەروونی فێری کردووین کە ڕۆڵی هۆکارە پەنامەکییە نائاگایەکان لە پێکهاتنی سایکۆلۆجیای مرۆڤدا و لە نێو ئەم هۆکارانەی کە دەبێ بەهەند هەڵبگیرێ نەك تەنیا ئەو هۆکارانەی کە هاوکاری کۆمەڵایەتی دەخوازن و خۆیان لەو وتەیەی ئەرەستۆ دەبیننەوە کە دبێژە "مرۆڤ، ئاژەڵێکی سیاسییە"، بەڵکە پاڵنەرە شەڕانییە خورت و بەهێزەکانیش کە دەبێ بە توندی جڵەوییان بگیرێ تا مرۆڤ بەرفەرمانی پێداویستییەکانی سیستەمی جڤاکی ببێت. ئا لێرەوە پێویستیی زۆرلێکردن سەرهەڵدەدا، هەروەکو فرۆید بەراشکاوی ددانی پێداناوە. فرۆید باوەڕی وابووە کە دەشێ ستۆپ بەم پاڵنەرە شەرانگێزییانە بگیرێ و مشتوماڵ بکرێن نەك لەناو ببردرێن. تا شارستانێتی ململانەی تێدا بەردەوام ببێت



لەنێوان پاڵنەری کۆمەڵایەتی و پاڵنەری شەڕانی. فرۆید لەبارەی شیانی دوورخستنەوەی ئەم پاڵنەرەی دواییانەوە بە تەواوی، دبێژە: "ئەم سەردەمە، دەبێ بە سەردەمی زێڕین، لێ گومان لەوە دا هەیە بەشێوەیەکی ڕەها بگەینە ئەم ڕەوشە، بەلایەنی زۆرەوە وا دێتەبەرچاو، کە دەبێ هەموو کولتوورێك پشت بە زۆرلێکردن ببەستێ و غەریزەکان توڕبداو نکوڵیان لێبکات". پاشان دەنووسێ و دەڵێ "خەڵك، ئافەریدەی خشکۆك و بەسۆز نین، کاتێ پەلاماریان دەدرێ داکۆکی لە خۆیان دەکەن.. دەبێ ئەم حەزوو ئارەزووە هێژایە بۆ دەستدرێژیکردن، حیسابی بۆ بکرێ بەو پێیەی بەشێکە لە غەریزە خۆڕسکەکانی خۆیان. هەروا شێوازی پاڵنەرە نا کۆمەڵایەتییەکان، نائومێدی و بێ ورەیی دەنێتەوە، هۆکارێکی بنەرەتیی گرنگە لەو نەخۆشییە باوانەی کە ئەمرۆ شارستانێتییە پەرەسەندووەکان بەدەستیانەوە دادەدادیانە. کۆمێنتارێکی مۆدێرن دەوری بنەما ئاکارەکییەکانی لە کۆمەڵگەی مرۆیی بەپێی چەمکی فرۆید بەم شێوەیە پوختە کردووەتەوە "دەسبەرداریی ئەم بنەما ئاکارەکییانە کارێکی کەس نەکردەیە، کە بێ وان شارستانێتی بەرپا نەدەبوو لێ لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی خەفەتبارانە کۆسپ بوون بۆ قوڵترین پاڵنەرەکانی مرۆڤ. لەبەر ئەم هۆیە فرۆید بەتوندی پێی لەسەر باندێگی نێوان کۆمەڵگەی شارستانی و سیستەمی کۆمەڵایەتیی زۆرلێکردن داگرتووە" و دەشێ ئەوەشی بۆ زیاد بکەین کە مێژووی نوێ بوونی ئەم پاڵنەرە شەڕانییانەو هێزو بڕستیان و ئەو نائومێدییە بنەڕەتیانەی کە نیگەرانی بۆ شارستانێتیی ئێمە دروست دەکەن کە فرۆید دەستی لەسەر داناوەو ناکرێ بەهیچ پێوەرێکی کامڵی زانستانە هەڵبسەنگێندرێ.

بەهەق هەمیشە ئەو ئومێد و هیوایە هەبووە کە سروشتی مرۆڤ دەگۆڕێ و ڕژێمێکی تازەی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ کە لەبارترو پێڕەوکراوتر بێت، سەرهەڵدەدا. تەنانەت ئەگەر دی میستەر de Maistre یش لەسەر هەق و ڕاست بێت کە

کۆمەڵگەی شارستانی لەسەر مێر غەزەب و جەللاد دامەزراوە، ئەوا دەشێ بەردەوام بێژین کە هیچ پێویستییەك نییە کە بەم شێوەیە بێت و بەبەردەوامیش بەم شێوەیە نابێت. لێ واقیعی ئێستا، هەروەکو مێژووی دیرۆکی مرۆڤایەتی دەخوێنینەوە، ئەوەیە کە قانوون وەکو هۆکارێکی کارای زەبتی کۆمەڵایەتیی، ئەگەر لە گرنگی توخمی زۆرلێکردن کەم بکاتەوە یان خۆی لێ نەبان بکا، ئەوا قانوونێکی بێ کەڵکە و تا بە رۆژی ئەمرۆشمان دەگات بەدەردی کۆمەڵگە ناخوات. ئەگەر ئێمە بڕوامان بە هەڵاتنی سپێدەی رژێمێکی نوێی جڤاکی هەیە و پێویستیی بە داپلۆسین نەهێڵێ، ئەوا وا دەخوازێ چاو بە سیستەمی قانوونی خۆمان بەشێوەیەکی رادیکاڵ دابخشێنینەوە. لێ واقیعی ئێستا ئەو گومانە بەهێزەی لە دەروونمان چەکەرەی کردووە نارەوێنێتەوە.

## رێساکانی هێز

بەشێکی گرنگی تەرزە سیستەمی قانوونیی ئێمە، ئەو رێساو بنەمایانە دەگرێتە خۆی کە زەبرو زەنگ بەکارهێنان رێکدەخەن وەکو دەستئاوێژێك بۆ جێبەجێکردنی بەشەکانی دیکەی سیستەم کە ئەو بنەمایانەن رەوتاری سوژێتەکانی ئەم سیستەمە رێکدەخەن. دەشێ بێژین ئەم بەشەیان ئەو بڕیارو حوکمانە دەگرێتەوە کە پێوەندییان بەهێزەوە هەیە، ئەو ژی لە سیستەمێکی "پریمیتڤ" کە دەشێ هەندە حوکمێکی تێدابێت بۆ سەروبەرکردنی ئەو هەراو دژمنداررییانەی لە ئاکامی تۆڵەو تۆڵەساندنەوە دەکەونەوە جیایە لە سیستەمێکی نێودەوڵەتی کە تەنیا چەند دەقێکی پرەنسیپئاسای کەمی تێدایە کە دەسەڵات بە دەزگایەکی وەکو نەتەوە یەکگرتووەکان دەدەن هێزێکی نێودەوڵەتی بۆ مەبەستێکی تایبەت پێکەوە بنێت، بۆ هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو رەوشە کە لەوانەیە هەرەشە لە ئاشتی بکات وەکو



ئەو هەراو و بشێوییەی لە کۆنگۆ روویاندا. هەروا سیستەمی دەوڵەتێکی زۆر پەرەسەندوو کە دامودەزگای قایم و پتەوی وەك دادگە و پۆلیس و کارمەندو.. هەیە.

ئەمە بووە بە خەسڵەتێ لە خەسڵەتەکانی قانوونی دەوڵەتێکی پەرەسەندوو کە تا چەند هێز بەکارهێنان رێکوپێکترو کاراتر ببێ دژی بەرهەڵستکاران ئەوا هێزبەکارهێنان تادێ بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. ئا بەم شێوەیە دەبینین دەوڵەتی بیروکراتی لەمبارەوە بەو سیستەمە دەچێ کە لەرووی تیورییەوە تەواو جیاوازە. واتە سیستەمی فەرمانڕەوایی کەسایەتیی کاریزمایی کە تیایدا دەبینین توخمی دەسەڵات بەسەر پێویستیی بە هێزدا زاڵە. ئەمەش لە کاتێکی گونجاودا ئەم تێڕوانینەی لێ پەیدا دەبێ کە پێشتر لێمان کۆڵییەوە ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز هێز یان بەلایەنی کەمەوە یەکێکە لە بیچمە بنەڕەتییەکانی قانوون. قانوونزانێکی هاوچەرخ ئەمەی بە "واهیمەیەکی کوشندە" وەسپ کردووە لە وتارێکدا کە هەندێکی لێ دەخەینە بەرچاو:

"لەگەڵ ئەوەی کە زەبروزەنگی راستەقینە زۆر لەبەرچاوان دوور کەوتووەتەوە، هەرچەند لەبەرچاوان ون ببێ ئەوا هەندەش کاری دەزگای قانوون ئاسانترو کەم هەراسانتر دەبێ. لەمبارەوە سەرکەوتنی چەندین دەوڵەتی نوێ بە پلەیەك کە لە پەرجوو دەچێ، بەلەبەرچاوگرتنی سروشتی مرۆڤ. لەسایەی هەلومەرجی گونجاودا، زەبروزەنگ بەکارهێنان زۆر کەم بووەتەوە بەبێ ئەوەی کەس تێبینیی بکات".

ئەم بارە دەستەبەرە کە ئەو باوەڕە دروست ببێ کە زەبروزەنگ بە قانوون نامۆیە یان گرنگییەکی لاوەکی هەس و ئەمەش واهیمەیەکی کوشندەیە. چونکە یەکێ لە مەرجە بنەڕەتییەکانی کەمکردنەوەی زەبروزەنگ بەکارهێنان تا ئەو پلەیە برێتییە لە بوونی هێزێکی ئۆرگانیزەکراو کە شنگ و توانایەکی هەمەگیری هەبێ بەبەراورد لە گەڵ هێزی هەر ناحەزو نەیارێك. ئەمە بەگشتی، ئامانجی هەر دەوڵەتێکی

ڕێکوپێکە بەپێی بنەماگەلی مۆدێرن. لەسۆنگەی ئەمەوە بەرەنگاریی کارێکی بێ فەرە. ئەوانەی خۆیان بەپێڕەوکردنی هێز لە مەسەلەگەلی سزاکاری و مەدەنی بەنسبەت کەمن لێ بەورد ئۆرگانیزەکراون و لە هەر کێشەیەك پێوەندیی بە تاکە کەسێکەوە یان چەند کەسێکی کەمەوە هەیە.

بەر لەوەی لەم فەسڵە ببینەوە وا دەخوازێ دوو خاڵ قسەی لێ بکەین. یەکەمیان ئەوەیە کە لە سیستەمێکی قانوونیی پەرەسەندوودا دەشێت ئەو بنەمایانەی پێوەندییان بە هێزبەکارهێنانەوە هەیە سەرلەبەری دەزگای کارڕاییی بگرێتەوە. چونکە ئەو بنەمایانەی هێز بکارهێنان ڕێکدەخەن وەکو زیندان یان بەجێگەیاندنی سزای لەسێدارەدان دوا قۆناخی دادخوازییە کە زۆر زەحمەتە لە زۆر باردا بیگەیەنێ و لە پرس و کێشە مەدەنییەکاندا بەگشتی. ئەم قۆناخە کاتێکی درێژی گەرەکە لەبەر ئەو کارڕاییە ئۆرگانیزەکراوانەی کە دەبێ ڕەچاو بکرێن و ناکرێ هیچ حوکم و بڕیارێك دەربکرێ تەنیا دوای ئەوەی هیچ ڕێگەیەکی دی نامێنێ. بەپشتبەستن بەم کارڕاییانە دەشێ فەرمان دەربکرێ کە بەپێی ئەوە هێزەکانی دەوڵەت بۆ سەپاندنی هێز بەسەر هەندێ کەسدا بەکار دەهێندرێ، ئەم کارڕاییانەش بەتەنێ کارڕاییی دادوەری نین، چونکە بەکارهێنانی زەبروزەنگ لەوانەیە ئاکامی کارڕاییەکی ئیداری یان تەنفیزی بێت. نموونەی ئەمە، وەزیری ناوەخۆی بەریتانیا فەرمانی دا کابرایەکی مشەخت بگیرێ و دەربکرێ چونکە بەشێوەیەکی نا شەرعی هاتبووە ناو بەریتانیا. دەکرێ وا سەیری بڕیارو حوکمەکانی هێز بکرێ بەو پێیەی فەسڵێکە لە فەسڵەکانی کتێبێکی گەورەتر سەبارەت بەو بڕیارو حوکمانەی پێوەندییان بە دەزگای کارڕاپەراندنەوە هەیە کە ماف و ئەرکە هەوەڵێنەکان تەرجەمەی کارو ئیشی کارا دەکات. ئەمەش بەو مانایە نییە کە سیستەمگەلی قانوونیی نییە تەنیا بە پێی ئەو حوکمانەی کە لەسەر ئەم ئەساسە پۆلین کراون، بەڵکە ئەمە پێویستە و گرنگە تا راو



بۆچوونێکی کارا سەبارەت بە "نموونەی ئایدیالی"ی ئەو قانوونە گەڵاڵە بکەین کە لەگەڵ سیستەمگەلی هەنووکە بە پلەیەکی گەورەتر یان نزمتر جووت بکەین.

خاڵی دووەم گرنگیی توخمی زۆرلێکردنە لە قانوون کە خراپ لێی حاڵی بوون یان زیاد لەپێویست لێکدانەوەی فراوانی بۆ کراوە بەپلەیەك کە هەر قانوونێك پێڕەوکردنی هێز "یان سزا هەروەکو پارێزەران پێیان خۆشە وا بێژن"ی تێدا نەبێت ناشێ بە قانوون بژمێردرێ. ئەم رایە لەگەڵ ئەو تێوریيە ڕێکە کە پێی دەگوترێ تیوریی فەرماندەری قانوون کە قانووناس "جون ئوستن" پرۆپاگندەی بۆ دەکردو کاریگەرییەکی زۆری لەو وڵاتانە دانا کە کار بە قانوونی عورفی دەکرێ بەتایبەتی بەریتانیا.

ئێمە لەو فەسڵەی کە بۆ ئەم تیوریيە تەرخانکراوە چارەسەری ئەم تیوریيە دەکەین، لێ لێرەدا ئەوە بەسە کە تیبینی ئەوە بکەین کە سەرەڕای ئەوەی کە زۆرلێکردن دەشێ ببێ بە بەشێکی جیانەبووەوەی سیستەمێکی قانوونی کارا، هیچ پاساو هۆیەك لەئارادانییە کە پێ لەسەر ئەوە دابگیرێ کە بەناچاری هەر بڕیارێکی تاکەکەسی لە سیستەمی قانوونیدا، دەبێ ئاکامگەلی سزایی بەدواوە بێت و پێچەوانەش راستە. کە دەبینین سیستەمی مۆدێرن زێتر گەرەکیەتی ئەرکە گرنگەکان دیاری بکا ئەوانەی کە پێویستیان بە دەقگەلێکی سزاکاریی پاشکۆوە نییە. جێگەی نامۆییە کە ناچار بکرێین کە ئەم ئەرك و پابەندبوونانە بە نا قانوونی دابنێین.

# قانوون و ڕەوشت

لە بەشی پێشودا بینیمان ئەو خەرمانە شەرعییەی بەدەورەی دەسەڵاتی قانوون هەڵچنراوە، بەندە بەبڕوابوون بە پەیوەستبوونێکی ئەخلاقی بە ملکەچکردن بۆ قانوون، هەروا لە هەمانکاتدا هۆشدارییەکیشمان دا کە پەیوەندیی قانوون بە ڕەوشت پەیوەندییەکی هێندە سادە نییە. لەم بەشەدا بە درێژی و بە گشتی باس لە پەیوەندیی نێوان قانوون و ڕەوشت دەکەین، دواتر لەو چوار فەسڵی دادێ، ئاکارە تایبەتییەکانی مەسەلەکە ڕاڤە دەکەین، کە بریتین لە:

یەکەم: چارەسەرکردنی قانوونی سروشتکرد کە بەرجەستەی چەمکی سەرەکی قانوونێکی باڵاتر دەکات کە قانوونی مرۆڤکرد ڕێکدەخات و گورج و زەبتی دەکا.

دووەم: تیۆری دانراو کە پێیوایە، قانوونی دانراو ئاقارێکی سەربەخۆی هەیە و هیچ قانوونێك ناتوانێت تانووتی لێبدات جا چ قانوونی سروشتکرد بێت، یان هەر قانوونێکی تر.

سێیەم: کێشەی قانوون و داد.

چوارەم: پەیوەندیی نێوان قانوون و ئازادی.

لەم چوارچێوەیەشدا لە هەر پێنج بەشی داهاتوو کێشەی قانوونی مرۆڤکرد، واتە ئەو قانوونەی مرۆڤ خۆی دایدەنێت و زانایان ناوی دەنێن (قانوونی دانراو)، ڕاڤە



دەکەین و تێدەگەین ئەو قانوونە بەندە بە سیستەمی بەهایەکان کە مانا و ئامانج و ڕوخسارێکی بەجیاهەڵکەوتووی مرۆڤانە بە ژیانی مرۆڤ دەبەخشێ.

## قانوون و ئایین

لەم سەردەمەدا لەگەڵ چەمکی عەلمانیی قانووندا ڕاهاتووین هەروەکو مرۆڤ خۆی، بۆ مرۆڤی داڕشتووە و بە پێودانگە مرۆییە ئەبستراکتەکان حوکمی لەسەر بدەین. ئەمەش زۆر جیاوازە لەوەی کە لە چاخەکانی پێشوودا باو بووە، ئەو کاتە وا دەزانرا قانوون پیرۆزە و لە سەرچاوەیەکی خوایی، یان ئاسمانییەوە هەڵدەقوڵێ. ئەو کات قانوون، ڕەوشت و ئایین بە شێوەیەکی زۆر پتەو بە یەکترەوە بەندبوون و هەندێ قانوون هەبوون کە وا حسێب دەکرا لەلایەن قانووندانەرێکی خوداییەوە داڕێژراون، وەکو دە ڕاسپاردەکە، هەروا قانوونگەلی تریش هەبوون کە بەم چاوە سەیر دەکران گەرچی سەرچاوەکانیان ڕاستەوخۆ لە مرۆڤەوە بوون، ئەمەش لە ڕێگەی بەخشینی ئیلهامی خودایی بە دانەرەکانیان. قانووندانەران لە دێرین زەماندا بە نیمچە خواوەند و پاڵەوان و میتۆلۆژیست ئەژمار دەکران. ئەم تێڕوانینە سەرنجڕاکێشە لە چارەسەرکردنی یۆنانی دێریندا بەرچاو دەکەوێ لە کتێبەکەی **ئەفلاتوون** بە ناونیشانی (قانوونەکان)، کاتێك ئەسینایێك، لە کریتییەك دەپرسێ کێ قانوونتان بۆ دادەنێ؟ خوا، یان مرۆڤ؟ لە وەڵامدا کریتییەکە دەڵێ: (بۆچی، بێگومان بۆ خوا دەگەڕێتەوە!).

ئەم هەستە بەراییە کە قانوون لە بنەمادا بە شێوەیەك لە شێوەکان بە ئایینەوە بەندە و دەکرێ بۆ جێبەجێکردنی قانوون، سزایەکی خوایی، یان نیمچە خوایی بسەپێنرێ، تا ڕادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو (خەرمانەی) بە دەسەڵاتی قانوون دراوە، بەتایبەتی بۆ ئەو بڕوایەی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد کە

پەیوەستبوونێکی رەوشتەکی هەیە سەبارەت بە ملکەچکردن بۆ قانوون، کەسێك نییە، لەوانەی باوەڕیان وابوو خواوەندان لە بانەوە راستەوخۆ، یان لە رێگەی مرۆڤەوە ناوەڕۆکی ئەو قانوونانەیان بە پیتی ئاگرین وێنا کردووەو ناسوێن، ئەوەندە بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بۆچوونە فیکرییە تازەیەی زانا (**ئۆستین**) کە دەڵێ: قانوون بۆ ئەوەی دەستڕۆ بێ پشت بە سزای قانوونی دەبەستێ، یان بەو سزایەی پێیەوە لکێنراوە، سزای مرۆڤیش لە قۆناغەکانی بەراییدا پێویستی بە قانوون نەبووە بۆ ئەوەی بسەپێنرێ، بەڵکە بە پێچەوانەوە سیستەمگەلی کەونارا تژی جۆرو شێوەی جیا-جیای سزا بوون بە ترسناکترین شێوازەکانی ئازاردان و ئەشکەنجە، هەروەك بڕینی ئەندام و داهێنانی ناوازەی ئەوتۆ کە قانوونی سزاکانی رۆمانی تێیدا دەسڕەنگین بوو، وەکو بەستنەوەی بکوژی باوك بە تورەکەیەك وفڕێدانی بۆ ناو دەریا بە هاوڕێیەتی سەگێك، یان کەلەشێرێك، یان مارێك، یان مەیموونێك تەنانەت ئەگەر تاوانبارکراو رزگاریشی بووایە لە سزای مرۆڤ، ئەوا خوا بە شێوازی تایبەتی خۆی و لەو کاتەی کە خوا حەز بکا بە سزای بگەیەنێ. بەسەرهاتی (ئۆریست Orestes) کە چیرۆکێکی تراژیدیای زۆر ناسراوی یۆنانی دێرینە، بەروونی نیشانی دەدا کە باوەڕیان وابووە خواوەندان سزای پێشێلکاری قانوون دەدەن. ئۆریست لە تۆڵەی باوکە کوژراوەکەی، دایکی خۆی و دۆستەکەی دەکوژێ، ئیدی خوا غەزەب دەیگرێ و بێ وچان وەدوای ئۆریست دەکەوێ بە تاوانی کوشتن تاوانبار دەکرێ. خوا، توڕەیی دانامرکێتەوە تا ئەو کاتەی خوداوەندە (ئەسینا)، واتە خوداوەندی حیکمەت دەخالەت دەکا. ئەم ئەفسانەیە پلەو رادەی نەرمی نواندن لە بەڕێوەبردنی دادی خودایی کە دەرەنجامی سیستەمی چەند خودایی بووە، دووپات دەکاتەوە، واتە دەکرا خواوەندێك لەلای خواوەندێکی دیکەدا تێهەڵبچێ و زەبت و رەبت و توندوتیژی قانوون سوك و هێورکاتەوە.



وێڕای ئەوەی کە ئایین لەمبارەوە رۆڵێکی بنچینەیی گێڕاوە و ناوەڕۆکی سزایی تایبەت بەئایینی بە قانوون بەخشیوە، لێ دەبێ گومان لەوەدا نەکرێ کە سەرجەمی ئەو قانوونەی لە دەوڵەتێکدا پراکتیزە دەکرێ بێ سێ و دوو راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ لە خوداوە سەرچاوە ناگرێ. چونکە زۆر جاران بەشەکانی قانوون لێك جیادەکرانەوە کە کامەیان بنەڕەتییە و ناکرێ بگۆڕێ، چونکە قەوارەی کۆمەڵگە و پەیوەندیی تاکەکان بە حوکمڕان و گەردوونەوە رێکدەخات، بە بەراوورد بەو قانوونانەی مرۆڤ دایناون، ئەو گرنگییە ئاسمانی و گەردوونییەیان تێدا بەدی ناکرێ. بێگومان جیاکردنەوەیەکی بەم شێوەیە لە کۆمەڵگەیەکی کەونارای وەك کۆمەڵگەی میسر بواری دەرکەوتنی نەبووە، چونکە فیرعەون بە بەرجەستەی خودا لەسەر زەوی دادەنرا، چونکە هەر قانوونێك لە فیرعەونەوە دەرچووایە، هەرچەندە بابەتەکەی پەڕپووت و بێ ماناش بووایە ئەوا ئەو قانوونە دەسەڵاتی خودایی دەبوو. بەڵام لە هەندێ لە کۆمەڵگە بەراییە دێرینەکاندا فەرمانڕەوا و خواکان بەیەکەوە نەدەبەسترانەوە و لە بواری قانووندا بە شێوەیەکی خویا جیاوازی دەکرا لە نێوان ئەوەی کە چ خودایییە و چیش لە مرۆڤەوەیە.

## کاریگەریی یەهودی و یۆنانی

جولەکە و یۆنانییەکان بەتایبەت لە زۆرینەی گەلانی دونیای دێرین زێتر جێ پەنجەیان دیاربووە لە بەدیارخستنی دژبەری نێوان ژیانی خودایی و ژیانی مرۆیی بە چەند شێوە و شێوازێك کە کاریان کردۆتە سەر بیری قانوونی خۆرئاوایی، لەو کاتەوە تا ئێستا، عیبرییەکان تەواوی سیستەمگەلی چەند خودایی و فەرمانڕەوای خواوەندیان رەتکردەوەو لە جێگەیدا یەکتاپەرستی بێ چەندوچوونیان راگەیاندووە و بەویستی خودا، رەفتاری ئاکارەکی بەسەر تەواوی مرۆڤایەتیدا سەپێنراوە و

ملکەچکردن بۆ فەرمایشتی خودایی بە سزای خودایی سەرپێچیکاران چ تاك چ کۆمەڵ بن، دابین دەکرا. پەیامبەرە عیبرییەکان بە زمانێکی سامی توند مۆرکی پەیوەستبوونی شەریعەتی خوایان بەسەر فەرمانڕەوایان و گەلاندا وەکیەك دووپاتکردەوە، هەروەها ئەو سزایەش کە بەسەر ئەوانەدا جێبەجێ دەکرێ کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن. عیبرییەکان دانیان نا بەو فەرمانڕەوا و پاشایە موبارەکانەی خوا پەسندی کردبوون و بەپێی ئەمەش بە پیرۆز و موبارەك دەزانران. ئەمانیش چونکە پاشا بوون دەیانتوانی قانوون بەسەر گەلدا بسەپێنن، بەڵام چ دەبووایە بکرێ ئەگەر ئەو قانوونانە ناکۆك بووبان لەگەڵ شەریعەتی خودا؟ چۆن لە حاڵەتی وادا ویستی خودا دەچەسپێنرێ و جێگەی خۆی دەگرێ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە سەردەمی بانگەشەی گەورە بۆ ئایینی عیبری خویا بووە و لە بەشەکانی کۆتایی (تەورات)دا تۆمارکراوە. پاشاکان پێشنیار دەکەن لێ خودا خۆی رەفتار دەکا، بۆیە هیچ نووسراوێکی شاهانە نییە لە ویستی خودا بەرزتر و بەهێزتر بێت، هەروەك لە شەریعەتی موسادا هاتووە، (تەورات) پڕیەتی لە چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو سزا توندانەی سەپێنراون بەسەر ئەو پاشا و گەلانەی وێراون لە شەریعەتی خودا لابدەن لە پێناو خواوەندی تر، یان شێوە ژیانێکی سەیر. کاتێکیش ویستی خودا راستەوخۆ لە دەقگەلی خوداییدا جاڕ نەدەدرا ئەوا بەهۆی پەیامبەرانەوە رادەگەیەنرا. ئەمانیش (پەیامبەران) پلەو پایەکی فەرمییان نە لە دەوڵەت و نە لە پیشەی تیۆلۆجیی نەبووە، بەڵام هێزو بڕستیان لەو بەهرە خوداییەدا بوو کە لەلایەن خوداوە پێیان بەخشرابوو، بەمەش لە توانایاندا هەبوو بیرۆکەی فەرمانی خودایی لە قانوونی رەوشتەکی گەردووندا جێ بکەنەوە کە لەسەر دەستی ئەو بەهرەمەندانە دەکرا کە خودا هەڵیبژاردوون تاوەکو کەرەستە و هۆکارەکانی گواستنەوەی پەیامەکانی بن بۆ بەرەی ئادەمیزاد.



ئەم شێوە باسکردنەی قانوونی ئەخلاقی بە روونی نیشانی دەدا کە ئەو قانوونانەی فەرمانڕەوا دایانناوە لەوانەیە ناکۆك بن، بەڵکە زۆر جاریش ناکۆك دەبن لەگەڵ ئەو فەرمانە خوداییانەی کە خودا دایناون بۆ رەگەزی مرۆیی. هەروا لە قانوونی خوداییانەی رەوشتەکی روونکراوەتەوە کە لەم حاڵەتەدا قانوونی دانراو ناتوانێ لە رووی قانوونی خودایی بوەستێت و هیچ دەسەڵاتێکی بەدەستەوە نابێ تاوەکو بە رەوایی بمێنێتەوە، پاشایانیش دەسەڵاتی راڤەکردنی ئەو قانوونە خوداکردانە یان ئاشکراکردنیان لەدەستدا نییە.

ئەگەری ناکۆکبوونی قانوونگەلی مرۆڤکرد لەگەڵ قانوونگەلی خودایی، تەنانەت ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایانەش دایاننابن کە خودا هەڵیبژاردوون، بووە هۆی ئەوە مرۆڤ دووچاری قەیرانێکی رەوشتەکی ببێ. قانوون لەلایەك و رەوشت و ئایینیش لەلایەکی تردا بە دوو دەنگی جیاواز قسە دەکەن، وێڕای ئەو خەرمانەی کە دەوری قانوونی دانراو و دەسەڵاتە ئەدەبییەکەی داوە، ئەوا لەوانەیە لەگەڵ ئەو رەوشتەی دەسەڵاتی خۆی لەسەر هەڵچنیوە ناکۆك ببێت.. ناشکرێ زیاد لە پێویست رۆڵی عیبرییەکان لە بیری مرۆڤایەتی بنرخێنین لەو رووەوە کە قانوونی دانراو وەك بەرجەستەبوونێکی پێویستی رەوشت رەتدەکاتەوە، بەڵام لێرەدا دوو تێبینی هەن شایانی ئەوەن ئاماژەیان بۆ بکرێ:

یەکەمیان: ئایدیای قانوونی خودایی لەلایەن عیبرییەکانەوە هاتەکایە لە دەرەنجامی یەکسانیکردنی قانوون و رەوشت. تاکە قانوونی راستەقینە، ئەو قانوونەیە فەرمانەکانی خودا بەرجەستە دەکا و هیچ قانوونێکی دانراویش نییە بگاتە ئاستی قانوونی خودایی. مەبەست لە قانوون لێرەدا ئەو قانوونە رەوشتەکیەیە، یان ئایینییەیە کە خودا دایبەزاندووە، یان بەوەحی بە کەسانێکی بەخشیووە، بەمەش دەروازەی بە رووی تیۆکراتی (فەرمانڕەوایی خودایی) کردەوە کە لە دەوڵەتی دێرینی جولەکە و سەردەمە بەراییەکانی بزاڤی کەلڤانیی بینیمان کاتێ قانوون و

ڕەوشت یەك شت بوون و دان بە هیچ قانوونێك نەدەنرا ئەگەر وەحییێکی خودایی لە پشت نەبووایە. ئا لێرەوە کێشەی ناکۆکی نێوان قانوونی دانراو و قانوونی ڕەوشت بە شێوەیەکی دڵڕەقانە چارەسەرکرا و بە شێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ قانوونی دانراودا کرا وەك بڵێی جگە لە دەربڕینێکی قانوونی ئاکارەکی هیچی تر نەبێ.

دەشێ تێبینی ئەو مەترسییانە بکەین کە دەرەنجامی ئەم تەرزە بیرکردنەوەیەن لە تێبینی دووەمماندا لەسەر چەمکی عیبرانیی کە سەرچاوەی قانوونی ئاکارەکیە، جگە لەوەی بەوەحی خودایی لە تەورات تۆمارکراوە پشت بەو دەسەڵاتە دەبەستێ کە ئەو کەسانەی مومارەسەی دەکەن و دەتوانن قەناعەت بە خۆیان و خەڵکی تر بهێنن کە وەحییان بۆ هاتووە. سەرباری ئەمە، تەنانەت (تەورات)یش پڕە لە گومان و تەمومژی زمانەوانی و پێویستی بە یەکێك دەبێ کە دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ ڕاڤەی بکا ئەگەر وەکو قانوونێك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە ڕاڤەکردنیش بێ سنوورە، کاتێ باوەڕو دەمارگرژی کێ بەرکێ دەکەن بۆ کۆنترۆڵکردنی شوێنکەوتووانی خۆیان، ئەو کەسانەش نەفرەت و سزا بدرێن کە بە شێوەیەکی جیاوازتر قانوون ڕاڤە دەکەن. چونکە هەر ڕەتکردنەوەیەکی قەوارەی قانوونی باو بە ڕەتکردنەوەی ویستی خودا دادەنرێت، ئەوەی ئاشکراشە هەر کێشەیەك لە ڕادەربڕیندا لە بارەی ئەو خاڵانەی کێشمەکێشیان لەسەر دروست دەبێت، دەبێتە مایەی توندوتیژی لە تاواندا، کە هیچ کێشمەکێشێك لە بارەی قانوونی دانراو ناگاتە ئەو ئاستە.

ڕێگاچارەیەکی ئاوا دەبێتە هۆی سەرکەوتنی ڕای توندوتیژی ئەو ئەرتۆدۆکسانەی کەوا بیروباوەڕی ڕەوشتەکی خۆیان دەسەپێنن بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵەدا، هەروەکو لە ژنێف لە سەردەمی کەلڤانییەکاندا وابوو، یان دەبێتە ئاژاوەو بێ سەروبەری و هەرکەسێ بەئارەزووی خۆی قانوون ڕاڤە دەکا، هەروەك لە



سەردەمی ڕیفۆرمی یەکەمدا لە زۆربەی ناوچەکانی ئەڵمانیا وابوو کە سەرکردە دەمارگرژەکانی گروپە فەناتیکەکان هەوڵیاندا بیروڕای خۆیان بە سەر کۆی کۆمەڵگەکاندا بسەپێنن لە کاتێکدا پەتای ئایینی سیمای ئەو سەردەم بوو.

تاوتوێکردنی عیبرانییەکان بۆ قانوونی ڕەوشتەکی بە پشتبەستن بە وەحی کەسایەتی و ئیلهامی خودایی بە شێوەیەکی حەتمی ڕەگەزەکانی باوەڕی غەیبی و ناهۆشمەندانەی سەقامگیرتر کرد، ڕێگاچارەکانی خودا لەلای مرۆڤ بە تەواوەتی ناڕوون و شاراوە بوون هەروەکو لە (سفری ئەیوب)دا باسکراوە، بەڵام پێویستە مرۆڤ بە خۆشەویستییەوە ملکەچی ویستی خودا بێت هەتا ئەگەر تێشی نەگات. ئەیوب دەڵێ: ((باوەڕی پێدەهێنم هەتا ئەگەر بشمرێنێ)) ئەمە هەڵوێستێکە دەربڕی سیستەمی ڕەوشتەکی ژیرانەی پەسندکراوی ئاوەزی مرۆڤە، چونکە پەنا دەباتە بەر باوەڕ وەك بیانوویێکی ئەبستراکت چونکە ناتوانێ لە گەردوون بگات، ئەم هەڵوێستە لەو هەڵوێستە ناژیرە دەچێ کە لەم وتەیەدا هاتووە و دەڵێ: ((باوەڕ دەکەم ئەمە مەحاڵە)) ((crdoqui alabsurdum)).

ڕێك لەم خاڵەدا شێوە باوەڕی یۆنان سیستەمێکی ژیرانەی بۆ گەردوون هێنایە ئارا، چەند قانوونێکی خویا کە دەکرێ بە هۆی لێتوێژینەوەی ژیرانە درك بکرێن، گەردوون بەڕێوە دەبات، کە هێزێکی هاوشان و ئەلتەرناتیڤمان لە بری نادیاری و تەمومژی ڕەوشتەکی پێ دەبەخشێ.

ڕاستە هەندێ توخمی بەهێزی نالۆژیکی و ناخویا لە ئایین و فەلسەفەی یۆناندا هەن هەروەکو لە ڕێورەسمە نهێنییەکانی ئورفیزم و فیساگۆریزمدا بەدیاردەکەوێ.

هاوکات چارەنووس و قەدەر ڕۆڵێکی گرنگی لە کاروباری خەڵك و گەردووندا بینیوە و چارەنووسی مرۆڤ بە شێوازێکی نادیار دەستنیشان دەکا (هەروەك لە ئەفسانەی ئۆدیب)دا، گۆڕینی ئەم چارەنووسە لە سەرووی توانای خوداوەندەوەیە، بەڵام

سەرەڕای ئەم هۆكارانە لە فیكری یۆناندا عەقلانییەت گەشەكردنێكی چاكی بەخۆوە بینی، ئەویش ئەو پرەنسیپەیە كە باوەڕی وایە هەردوو سیستەمی جیهانی سروشتی و جیهانی ئەخلاقی لەسەر بناغەیەكی عەقلانی دامەزراون و ئاوەزی مرۆڤ بەشداربووە لە سروشتی ژیرانەی گەردوون بۆیە (مرۆڤ) دەتوانێت تێیبگات. ئێمە تا رادەیەكی زۆر قەرزداری ئەم شێوە تاوتوێكردنەین لەو باوەڕە تازەیەی كە ئەمڕۆ هەمانە بە قانوونگەلی زانستی و توانای فەلسەفەی عەقلانی لە راڤەكردن و رۆشنكردنەوەی پرەنسیپەكانی قەوارەی جیهان سروشتی و ئەو سیستەمە ئاكارەكییەی كە رەفتاری مرۆڤ بەڕێوە دەبات، هەروەها پەیوەندی مرۆڤەكان لەگەڵ یەكتر و لەگەڵ گەردووندا... باوەڕێكی لەم شێوەیە بە ئاوەزی مرۆڤ حەتمەن لە بواری رەوشتدا پێویست بە سەرهەڵدانی ئایدیای قانوونی رەوشتەكی دەكات لەسەر بنەمایەكی ژیرانە كە تیایدا خەسڵەتی فەرماندەرانەی قانوونی رەوشتەكی لەوەدا سەرهەڵدەدا كە پێویستە ئاوەزی مرۆڤ رێگاچارەی ژیرانە پەسند بكات بەوپێیەی رێگاچارەیەكی ئەخلاقییە، یان چارەسەرێكی حەقە. مادامەكیش گەردوون لەسەر بنەمایەكی ژیرانە دامەزراوە، ئەوا ئاوەز دەخوازێ ئەو حوكم و قانوونانەی خۆڕاگربوون لە بەرانبەر عەقلانییەتدا قەبووڵ بكرێن.

فەیلەسووفەكانی یۆنان دركیان بەوە كردبوو كە ئەو قانوونە مرۆییانەی لە كۆمەڵگە جیاجیاكاندا كاریان پێدەكرا زۆر لێكتر جیاوازن و بەشی هەرە زۆریان دژ بەئاوەز بوون، یان بە لایەنی كەم نەدەكرا بە تەواوەتی لەسەر بنەمایەكی ژیرانە پاساو بدرێنەوە. هەروەها نەدەكرا ناسنامەی ئولگوی عیبری لە میانەی قانوونە ئاسمانییەكان و قانوونە دانراوەكاندا دەستنیشان بكەین، بە هەمان شێوە یۆنانییەكانیش نەیانتوانی یەكلایی بكەنەوە كە كارپێكردن، یان بوونی قانوونە دانراوەكان راستەوخۆ كۆنترۆڵكراوە، یان بە شێوەیەك لە شێوەكان قانوونێكی ئاوەزی باڵاتر كاری تێدەكات.



لەمەودوا بە درێژی باس لە پەرەسەندنی بیرۆكەی قانوونی سروشتكرد دەكەین لە بیری یۆنانیدا.. لێرەدا تەنانەت ئاماژە بۆ ئەوە دەكەین كە بیری یۆنانی بەرەو ئەو لایەنە دەچوو كە دان بەوەدا بنێت قانوونی مرۆڤكرد، ئەگەرچی بەشێكی، یان هەموو سەرچاوەكانی لە كانیاوی خودایی، یان نیمچە خودایی ئاوی دەخواردەوە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێنێكی دیارو سەربەخۆی هەبوو لە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا.. سەبارەت بە رەوابوونیشی پشتی بە هیچ سەرچاوەیەكی خودایی نەبەستابوو، ئەگینا ئاسایی بوو قانوون جۆرێك لە پیرۆزی هەبێت. لە هەمانكاتدا قانوونی دانراو هەرچەندە سەربەخۆبێ، بەڵام ملكەچی سانسۆری رەوشتە... ئەم سانسۆرەش لەدواساتدا مانای ئەوەیە كە قانوونی دانراو بەراوورد دەكرێ لەگەڵ عەقلانییەتێكی نموونەیی كە باوەڕ وایە لە تەواوی گەردووندا بوونی هەیە.

## ئەركی ئەخلاقی لە گوێڕایەڵیكردنی قانوون

ئاكارێكی هاوبەش لەنێوان هەردوو چەمكی عیبرانی و یۆنانیدا سەبارەت بە قانوون هەیە، هەردووكیان بە شێوازی جیاواز جەخت لەسەر پێویستی رووبەڕووبوونەوەی ئەو ململانێیە دەكەنەوە، كە رەنگە لە نێوان پەیوەستبوونی سەپێنراو لە قانوونی دانراو و ئەو پەیوەستبوونەی كەوا قانوونی رەوشتەكی دەیخوازێ، بێتە ئارا، لە روانگەی عیبرییەوە هەر قانوونێكی دانراو بە دەق سەرپێچی قانوونی خودایی بكات بێ مایەو پووچەڵە و پێویستە پشتگوێ بخرێت بەهەر نرخێك بێت (وەكو رێگەدان بەژن و ژنخوازی لە نێوان مەحرەماندا) چونكە هیچ سزایەكی مرۆیی نییە باڵ بەسەر قانوونی خوداییدا بكێشێ، دەبێ متمانەش بەوە هەبێ كە دادی خودایی بۆ خۆی (بە شێوەیەكی نادیار) لە دوا حیسابدا لە نێوان فەرمانڕەوا و خەڵك و ئافەریدەی هەردووكیان، خۆی ئاشكرا دەكات.

لێ هەڵوێستی یۆنانیی سادەتر بوو، چونکە هەستێکی بەهێز هەبوو کە دەبێ مرۆڤ لە رووی ئەدەبییەوە پابەند بێ بە ملکەچکردن بۆ قانوونی دەوڵەت، با باوەڕیشی وابێ کە قانوونی دەوڵەت هەڵەیە، یان بێ رەوشتانەیە. زێتر لەمەش ئەم تێڕوانینە (تێڕوانینی یۆنانییەکان) دووچاری لاوازی و پەڕپووتی نەهات وەکو بیروباوەڕی پەیامبەرانەی عیبریی، نە لە رێگای باوەڕهێنان بە ناسنامەی زەروریی قانوون و رەوشت، نە لە رێگەی جەختکردنەوەی بەرچاو کۆنکرێت و روون کە قانوونی دانراو، وەکو قانوون کاراییی کەمترە، هەتا ئەگەر لەگەڵ ئاوەزیشدا دژ بێت، ئەمەش لە مونازەرەکانی ئەفلاتوون لە (کریتۆ)دا رۆشنە، کاتێ **سوکرات** بۆ هاوڕێیەکەی باس دەکات کە بۆچی پێویستە لەسەر سوقرات گوێڕایەڵی قانوونی دەوڵەت بێت، کە لەوانەیە حوکمەکەش دڵڕەقانە بێ و، هەوڵی هەڵاتن لە سزا بە کارێکی هەڵە دەزانێت، دەقی گفتوگۆی سوکرات لەگەڵ هاوڕێکەی بەم شێوەی خوارەوەیە:

سوکرات: ئایا پێویستە مرۆڤ رێککەوتنە دروستەکانی جێبەجێ بکا، یان بەجێیان نەگەیەنێ و پەیمانشکێنی بکا؟

کریتۆ: بەڵکە پێویستە بەجێیان بگەیەنێ.

سوکرات: کەواتە بیربکەوە، گەر من بێ رەزامەندیی دەوڵەت هەڵاتم، ئایا ئازاری ئەوانەم نەداوە کە پێویستە لەسەرم ئازاریان نەدەم؟ ئایا ئەوە ناگەیەنێ کە وازم لە رێککەوتنە دروستەکانم هێناوە، یان نا؟

کریتۆ: ناتوانم بەرسڤی پرسیارەکەت بدەمەوە ئەی سوکرات، چونکە تێیناگەم.

سوکرات: بەم شێوەیە بیری لێبکەوە: گریمان قانوونەکان و جمهوریەت لە پێشمدا بەدیارکەوتن و منیش خۆم بۆ هەڵاتن ئامادە دەکەم و لێیان پرسیم (سوکرات پێمان بێژە، بە نیازی چ بکەی، مەبەستت لە هەوڵی هەڵاتن چییە؟ ئایا ئەمە مانای تێکشاندنی سەرجەم قانوونگەل و شێواندنی شار ناگەیەنێ؟ پێتوایە دەوڵەت دەشێ



دامەزرێ و جێگیر بێ، کاتێك حوکمی قانوونەکان بێهێز و قێزەوەن بن، هیچ بەهایەکیان لای کەسان نەبێت؟ چۆن وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە دەدەیتەوە کریتۆ؟ دەشێ زۆر بگوترێ سەبارەت بە داکۆکیکردن لەو قانوونانەی حوکمی داد بەرزتر رادەگرن، ئایا لە وەڵامدا بڵێم (بەڵام دەوڵەت زوڵمی لێکردم، کێشەکەمی بە شێوەیەکی هەڵە ئاراستە کرد؟ ئایا ئەمە بڵێین؟)

کریتۆ: هەڵبەتە وا دەکەین سوکرات.

سوکرات: با وایدابنێین کە قانوون وەڵامی دایەوە (ئایا ئەمە بوو رێککەوتنەکەمان؟، یان پێویستە لە سەرت ملکەچی هەر حوکمێك بیت کە دەوڵەت سەبارەت بە تۆ دەریدەکات؟ مادام هاتییە ئەم دونیایە و ئێمە بەخێومان کردی، چۆن نکۆڵی دەکەی کە تۆ کوڕ و بەندەی ئێمەی هەروەکو باوانت بەر لە تۆ وابوون؟ ئەگەر مەسەلەکە ئاوابێ، ئایا پێتوایە مافەکانی تۆ لە ئاستی مافەکانی ئێمە دان؟ ئایا پێتوایە بتوانی هەمان شت بۆ نیشتمان و قانوونەکانی بکەیت؟ ئەگەر ویستمان تێکتبشکێنین، چونکە پێمانوایە ئەمە حەقە، ئایا لە بەرانبەردا هەموو شتێ دەکەی بۆ ئەوەی تێکمانبشکێنی، وڵاتەکەت و قانوونەکان تێکبشکێنی، دواتر بەخۆت دەڵێی تۆ بەمە کارێکی دروست دەکەیت، تۆ ئەی مرۆڤ ئەی ئەوەی بە حەق بیر لە چاکە دەکەیتەوە، یان ئەوەتا هەندە بە حیکمەتی کە پیتوایە نیشتمانەکەت لەدایك و باوك و باپیرانت شایستەتر و گەورەتر و پیرۆزترە، ئەرکی پابەندکارانەی تۆش ئەوەیە پەیڕەوی بکەیت، هەرچیت لێ داوا بکرێت ئەنجامیدەیت یان پاکانەیان بۆ دێنیەوە، بەکرێ گوێڕایەڵی دەبیت، ئەگەر فەرمانی دایتێ بەرگەی سزای جەڵد و زیندان بگریت. ئەمە ئەرکی تۆیە لە جەنگ و لە کاتی دادگاییکردن و لە هەر شوێنێك بیت، لەسەرتە ئەوە بکەیت کە شارەکەت و وڵاتەکەت لێتی دەخوازن، یان پێویستە لەسەرت قەناعەتیان پێبیهێنی کە فەرمانەکانیان نادادپەروەرانەیە! بەڵام بەکارهێنانی زەبروزەنگ لە دژی دایك و

باوکت پێشێلکردنی قانوونی خودایە، هەروەکو چۆن زەبروزەنگ بەکارهێنان لە دژی نیشتمانەکەت پێشێلکردنێکی توندتری قانوونی خودایە، بڵێم چی کریتۆ؟ ئایا دەڵێی قانوون بە حەق دێتەگۆ، یان نا؟

کریتۆ: پێموایە بە حەق دێتەگۆ.

ئەمە ئەو تەنگژە بەژانەیە کەوا لە بەرانبەر هاووڵاتیانی ئەسینادا خرایەڕوو لە سەدەی چوارەمی پێش زایین لەو بیرۆکەیەدا کە دەڵێ: ژیان بەپێی قانوون باڵاترین قانوونی نەنووسراوە، هەتا ئەگەر دەرەنجامی ئەمەش دەرکردنی حوکمی مردن بێت بەسەر پیاوێکی هەرە دانادا هەروەکو ئەفلاتوون لە کێشەکەی سوکراتدا ئاماژەی بۆ کردووە و پێشنیارێکی بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئاریشەیە خستە روو، ئەویش ئەوەیە کاتێ دەوڵەت خۆی بەرجەستەی بیرۆکەی خێرە، ئەوا دەشێ ژیانی تاکەکەسان بکرێتە قوربانی لە پێناو دەوڵەتدا، بە واتایەکی تر ئەفلاتوون بانگەشەی بۆ چوونیەکی لە نێوان قانوون و رەوشتدا کرد، بەڵام چوونیەکییەك پشت نابەستێ بە باوەڕی کوێرانە بەڵکو بە حیکمەت و ئاوەزی مرۆڤانە، لەو بارەیشدا دواتر بە درێژی دەدوێین، بەڵام لێرەدا ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ ئەو خاڵانە بکەین کەوا (کریتۆ) لە هەڵوێستی یۆنانیدا ورووژاندنی، خاڵی یەکەم: دان بەوەدا دەنێ کە ملکەچکردن بۆ قانوونی دەوڵەت لە خودی خۆیدا پرەنسیپێکی رەوشت باشییە، بۆیەش سوکرات دایەلۆگ و مشتومڕەکەی دەپڕژێنێتە سەر جۆرێ لە رێککەوتن (دارشتنێکی دێرین، یان سەرەتایی سۆسیال کۆنتراکت) لە نێوان هاووڵاتیان و دەوڵەت بۆ ئەوەی قانوونەکان لەبەرچاو بگیرێن سەرەڕای ئەو ئاکامانەی بۆ تاکەکەسێك دەیبێت.

خاڵی دووەم: لە هەمانکاتدا دەڵێ، قانوونێکی رەوشتەکی سەربەخۆ لە قانوونی دەوڵەت هەیە، دەکرێ لە رێگەیەوە بزانین کە ئایا قانوونی دەوڵەت ستەمکارە، یان



بێ رەوشتانەیە، خاڵی سێیەمیش ئەوەیە کە قانوونی رەوشتەکی باز بەسەر قانوونی دەوڵەت نادا تا ئەو مەودایەی کە تێیدا تاکەکەس مەبەست بێ، چونکە ئەرکی تاکەکەس ئەوەیە، هەوڵبدات دەوڵەت ئیقناع بکات کە دووچاری هەڵەیەکی رەوشتەکی بووە، ئەگەر لەم ئەرکەشدا سەرنەکەوت ئەوا هیچ چارەیەکی نامێنێ، دەبێ گوێڕایەڵی قانوونی دەوڵەت بێ، بەڵام قانوونی خودایی گوێڕایەڵیکردنی قانوون دەسەپێنێت هەتا ئەگەر قانوونەکە نادادپەروەر بێت. لەمەش روونتر نابێ کە چەند ناکۆکە لەگەڵ ئایدیای عیبرانیی کە دەڵێ پێویستە قانوونی دەوڵەت ملکەچی قانوونی خودا بێت، چونکە فەرمانگەلی خودایی هەرچەندە توندیش بن ناتوانن پشتیوانی زوڵم و ستەم بکەن لە دژی داد. ئایدیای عیبرانیی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تەنها ئەو کاتە قانوونی دانراو پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت کە لەگەڵ قانوونی خودایی دەگونجێ، بەڵام ئایدیای یۆنانیی لەلایەکی تردا دەڵێ مومکینە قانوونی دانراو ناکۆك بێ لەگەڵ قانوونی رەوشتەکی، بەڵام پێویستە لەسەر هاووڵاتی، سەرەڕای ئەوەش، گوێڕایەڵی قانوونی ئەو دەوڵەتە بێت کە تیایدا دەژی و کار بۆ ئەوە بکات دەوڵەتەکەی بگەیەنێتە ئەو قەناعەتە کە قانوونەکە بگۆڕێ تاوەکو لەگەڵ بنەماکانی رەوشتدا بگونجێت.

## پەیوەندیی قانوون بە رەوشتەوە

دوای بەسەرکردنەوەی هەردوو تێڕوانینی پێشوو پێدەچێ یۆنانییەکان نزیکتر بن لە رای باوی دونیای هاوچەرخ بە هەندێ دەسکارییەوە، هەڵبەتە هەندێ هەن دەڵێن ئەرکی بەرفەرمانی بۆ دەوڵەت لە هەموو بارودۆخێکدا هەر هەبووە، لە فەلسەفەی (هیگڵ)دا، هەروەکو ساغ بووەتەوە کاریگەریی هەبووە لەسەر رژێمە تۆتالیتارە

تازەکان، تاکە کەس وەك بەشێکی ئاوێتەبووی راستییەکی باڵاتر و مەزنتر رەفتاری لەگەڵدا کراوە، ئەویش دەوڵەتە کە پێشبینی ناکرێ هەندە کراوەبێ تا گوێ لە تاکێك بگرێ کە پێی بڵێ هەڵەیە، یان بڕیاری دادگاکانی ستەمکارانە و بێ رەوشتانەن، چونکە دەوڵەت بۆ خۆی بە حوکمی حیکمەتی مەزنی خۆی (سوکرات گوتەنی) بەرجەستەبوونێکی راستەقینەی رەوشتە، هەرچەندە تۆتالیتارییەکان و دیموکراتیخوازەکان بە گشتی تا رادەیەك پەیڕەوی سوکرات دەکەن لەو رووەوە کە ملکەچکردن بۆ قانوون، ئەرکێکی ئەدەبییە هەیە، بەڵام جەختێکی زێتر لەسەر سنووری ئەم بۆچوونە دەکەنەوە لەو حاڵەتانەدا کە رێساو بنەماکانی رەوشت لەگەڵ دەقەکانی قانوونی دانراو ناکۆك دەبن.

گەرچی هەندێ حاڵەت و ململانێ هەن کە پەیوەستبوونی ئەدەبی باڵاتر ئەوەیە گوێڕایەڵیی قانوون بکرێ (سوکرات گوتەنی) تاکو تاکەکەس لە توانایدا دەبێت بگاتە قەناعەت بە دەوڵەت بهێنێ گۆڕانکاری لە قانوونەکاندا بکات، ئەوا هەندێ حاڵەت هەن کە قانوون ئەحکامێکی دژە رەوشت دەسەپێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قانوونی دانراو هەر پلە و پایەیەکی هەبێت، ئەوا ئەرکی رەوشتەکی ئەوەیە، قانوونی دانراو رەتبکرێتەوە نەوەك پەیڕەو بکرێت.

ئاکاری هەرە بەرچاوی ئەم تێڕوانینە ئەوەیە، بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر بنەمای هاوبەشیش هەبێ لە نێوان رەوشت و قانووندا، ئەوا پێویستە دان بەوەدا بنێین کە گونجانێکی پێویست لە نێوان فەرمانەکانی قانوون و بنەماکانی رەوشتدا نییە، هەرچەندە ئەرکێکی رەوشتەکی هەبێت لە ملکەچکردن بۆ قانوون ئەگەرچی ئەم قانوونەش لە ناوەڕۆکدا کۆك، یان ناکۆك بێ لەگەڵ رەوشتدا، جا ئەگەر ناکۆکییەکە لە نێوان هەردوو پرەنسیپدا (رەوشت و قانوون) توندو بنەڕەتی بوو، ئەوا رەوشت، پاساو بۆ گوێڕایەڵ نەبوون دێنێتەوە. لە بەشی داهاتوودا باس لەم مەسەلەیە دەکەین کەوا ئاستەنگی زۆر گرنگ بۆ پارێزەران و رەوشتخوازان و هاووڵاتییە



سادەکان دێتە پێشەوە، تەنها باس لەو لایەنانە دەکەین کەوا قانوون و رەوشت تێیاندا کۆکن و باس لەو هۆکارانەش دەکەین کەوا زانا نوێخوازەکانیان هاندا پاساو بۆ رەتکردنەوەی بیرۆکەی چوو یەکبوونی تەواو لە نێوان ئەم دوو بوارەدا بهێننەوە.

کەسانێك پەیوەندی قانوون و رەوشتیان وەك دوو بازنەی تێکهەڵکێش وێنا کردووە کە بەشی ناوەوەی یەکتربڕینەکە زەمینەی هاوبەشی نێوان هەردووکیان و بەشەکانی دەرەوەش ئەو بوارە تایبەتانەن کە هەریەکیان بە رەهایی بەسەریدا زاڵە، ئەم وێنە سەرلێشێوێنە، چونکە هزرێکت لا دروست دەکا کەوا تێبگەی هەرکاتێ زەمینەی هاوبەش لە نێوان قانوون و رەوشتدا هەبێ ئەوا چوونیەکبوونیش هەیە، ئەمەش هەردەم دروست نییە.

چونکە دەتوانین بڵێین قانوونی سزاکان باس لە قەدەغەکراوە رەسەنەکانی ناو رەوشتی گشتی دەکات (بۆ نموونە کوشتن)، بەڵام لێرەدا جیاوازییەکی زۆر مەزن هەیە لە نێوان ئەوەی قانوون و رەوشت بە کوشتنی دەزانن!

لە قانوونی ئینگلیزیدا ئەگەر مردن دوای بەسەرچوونی ماوەی ساڵ و رۆژێك بەسەر ئەو کردارەی بووە هۆی کوشتن، روویدا، ئەوا تاوانی کوشتن لە ئارادا نییە، بەڵام لە چەمکی رەوشتدا هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ئەوەی (٣٦٦)، یان (٣٦٧) رۆژ بەسەر تاوانی کوشتندا تێبپەڕێ، ئەم جیاکردنەوەیە لە سیستمگەلی قانوونیدا پاساوی خۆی هەیە لەبەر رۆژنایی هەندێ ئیعتباراتی عەمەلی هەرچەندە هەڵوێستی وردی رەوشت لەگەڵیدا ناکۆکە.

لەگەڵ ئەوەشدا پانتاییەکی بەرینی هاوبەش لە نێوان قانوون و رەوشتدا هەر دەمێنێ کە دوورەدەست نییە، چونکە هەردووکیان بایەخ بە سەپاندنی ئاستێکی دیاریکراوی رەفتار دەدەن، کە زۆر سەختە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بێ ئەوە بژی، لە بەشێکی زۆری ئەو ئاستە بنەڕەتیانەدا قانوون و رەوشت وەك بەشێکی تەونی ژیانی

کۆمەڵایەتی پاڵپشتی یەکتر دەکەن. ئەگەر واز لە دەسدرێژیکردن بۆ سەر جەستەی ئەوانی تر و زەوتکردنی ماڵ و موڵکی خەڵکی تر نەهێنن، ئەوا ئاساییش لە ژیان و کارو سەوداو مامەڵەدا نامێنێ، کە بۆ پێشکەوتنی ژیان و بەختەوەری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێویستن، بنەماکانی رەوشت- بە شێوەیەکی گشتی دان بەوەدا دەنێن کە پێویستە خۆ بەدوور بگرین لە هەندێ کردار- هێزی قانوون سەقامگیرتر دەکەن کە ئەم کردارانە قەدەغە دەکات، سەرکۆنەی ئەدەبی کە لەو کردارانە دەکەوێتەوە بەو سزایانەی قانوون دەیانسەپێنێ بەهێزتر دەبێ، خودی قانوونی رەوشتەکی پێویستی بە هەبوونی سیستەمێکی قانوونیی هەیە تا ئەم پرەنسیپانە جێگیر بکات، جا ئەگەر قانوونی رەوشتەکی داوای رێزگرتنی موڵکایەتی کەسێکی تری کرد ئەوا پێویستە لە هەمانکاتدا بنەمای قانوونیی ئەوتۆ هەبن کە ئەو هەلومەرجە دەستنیشان بکات کە خاوەندارێتی تێدا بەدی بکرێت، (چونکە خاوەندارێتی چەکێکی قانوونییە ئەو ئەحکامانە بەخۆوە دەگرێ کەوا ئەو شتانە دەستنیشان دەکات کە دەشێ ببنە جێ و باسی خاوەندارێتی) هاوکات چۆن مرۆ دەبێتە خاوەندار و کەی خاوەندارێتی لەدەست دەدا، چۆن خاوەندارێتی دەگواسترێتەوە..تاد) مادامەکی هەر لە پێشتردا سیستەمگەلی قانوونیی هەبوون بۆ ئەوەی ئەو ئاستە رەوشتییانە بپارێزن کە بەسەر کۆمەڵگەدا پراکتیزە دەکرێن، ئەوا ئەرکی رەوشتیانەی گوێڕایەڵیکردنی قانوون، بە شێوەیەکی گشتی پەسندە و رۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێ لە چەسپاندنی دەسەڵاتی قانوون و دەستەبەرکردنی گوێڕایەڵیکردن لە زۆرینەی هەلومەرجەکاندا بێ ئەوەی بەکردار پەنابەرێتە بەر کارو کردەوەی سەکوتکارانە.

پێکچوونی پتەوی نێوان بنەماکانی رەوشت و قانوون لە پێکچوونی ئەو زمانەدا بەدیاردەکەوێ کە هەردووکیان بەکاری دەهێنن. هەردووکیان بایەخ بە دانانی بنەما، یان پێودانگێك بۆ رەفتاری مرۆڤ دەدەن، ئەمەش لە زمانی قانوونی و



ئەخلاقیدا گوزارشتی لێ دەکرێ بە زاراوەو وشەی وەك پابەندبوون و ئەرك، هەڵەو راست، قانوون و رەوشت ئەرکی من دەستنیشان دەکەن کە چ بکەم و چ نەکەم، یان مافم هەیە ئەوها هەڵسوکەوت بکەم، یان هەڵەیە ئەوها بکەم، ئەم زمانە هاوبەشە هەرچەندە تێکهەڵکێشانی هەردوو بوارەکە بەدەریدەخات، بەڵام مەترسیدارە لەو لایەنەوە کەوا هەڵشەکاران دەخاتە گومانەوە کە قانوون پێویستە پەیوەستبوونێکی رەوشتی تێدا بێت (بەشێکی ئەم شڵەژانە لە گووتەکانی سوکرات بەدیاردەکەوێ)، یان پێداویستییەکانی پەیوەستبوونی رەوشتی دەگۆڕێن بۆ قانوون.

## لە کوێدا قانوون و رەوشت لێك دووردەکەونەوە

سروشتییە ئەمە بەرەو خوێندنەوەی ناتەبایی و جیاوازیی نێوان قانوون و رەوشت و هۆکارەکانی ئەم جیاوازییەمان دەبات. دەبا بە یەك دوو نموونەی سادە دەست پێبکەین کە بۆمان روون دەکەنەوە چۆن قانوون و رەوشت بەدوو رێڕەوی جیاوازدا دەڕۆن سەرەڕای ئەوەی لەیەك پرەنسیپی چوونیەکدا دەستپێدەکەن، قانوون لەوانەیە بە زیاتر لە شێوەیەك گەندەڵی سێکسی سزا بدات، بەڵام نایەوێ دەسکاری دەرەنجامی قانوونیی هەندێ شێوەی بەدڕەوشتی وەك لەشفرۆشی و دۆست، زینای بێ زەبروزەنگ و ناچارکردن لە نێوان پێگەیشتووانی هەردوو رەگەز (نێر و مێ). هەروەها ئەرکی رەوشتیش بۆ ئەوەی ژیانیی یەکێك رزگار بکرێ، یان بپارێزرێ، لە زۆر حاڵەتدا نابێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەرکێکی قانوونیی. باوك لەوانەیە بەپێی قانوون پەیوەست بێ بە چاودێریکردن و پاراستنی کوڕەکەی، بەڵام لە رووی قانوونەوە پابەند نییە بە رزگارکردنی کەسێك کە خەریکە دەخنکێ، هەتا ئەگەر بشتوانێ رزگاری بکات

بێ ئەوەی گیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە[1] کەسێك چەقۆیەك لە هاوڕێیەکی دەخوازێ بەپێی قانوون مافی ئەوەی نییە بۆی نەگەڕێنێتەوە کاتێ داوای لێبکاتەوە، هەتا ئەگەر بیانووی بەجێشی هەبووبێ کە دەیەوێ بەکاری بهێنێ بۆ دەستدرێژیکردنە سەر کەسێکی سێیەم، لە تەواوی ئەم حاڵەتانەدا قانوون لەبەر هەر هۆیەك بێ لەوانە ناپێچێتەوە، کە بە ڕێبازی ڕەسەنی ڕەوشت دادەنرێن.

هۆکارەکانی ئەم ناکۆکییە جیاوازن و وەکو یەك نین لە رووی هێز و دەسترۆییدا لە زۆر حاڵەتاندا ڕەفتاری بەرزتری ڕەوشت وەکو پێویست بەرجەستە نابێ لە هەستی گشتیدا بە شێوەیەك کارێکی قانوونی ڕێککەوتوو گونجاو لەگەڵ خۆیدا بەرهەم بهێنێ، لەوانەشە قانوون ڕەنگدانەوەی بنەماکانی ڕەوشتی گشتی بێت ئەگەرچی بنەماکانی ڕەوشتی گشتی بە هێواشی دەخرێنە ژێر باری شێوازێکی سازگارتر و مرۆڤانە ترەوە، جا بەشێکی زۆری ماددەکانی قانوونی سزای دێرین لەگەڵ ئەو سزایە دڕندانەی کە تەرخان کرابوون بۆ تاوانە بێ ماناکان بەرە بەرە بەرەو سیستەمێکی جینایی مرۆڤانەتر بزوان (کە هێشتا نەگەیشتووە بە کەمال). ڕەنگدانەوەی ئەو جۆرە پەیوەندییە لە نێوان قانوون و هەستی گشتی، هاوکات چاکبوونی بەرەبەرەی ئاستەکانی ڕەوشت و قانوون بەیەکەوە بەدیار دەخات کاتێ تێکهەڵدەکێشرێن و یەکیان ڕەنگدانەوەی ئەوی تریان دەبێت، لەم جۆرە حاڵەتانەدا هاندەری چاکسازی (ریفۆرم)ی قانوون پشت بە تووێژێکی تا ڕادەیەك بچووکی ئەو کەسانەی خاوەن ئیرادە و هێزەکانی ڕەوشتن دەبەستێ تاوەکو گۆڕانێکی ئەوتۆ لە هەستی گشتیدا بەدی بهێنن بە مەبەستی گۆڕانێك لە قانووندا، ئەو پێشکەوتنەی لە بەریتانیا ڕوویداوە لە قانوونی تایبەت بە پاراستنی منداڵان و ئاژەڵان لە توندوتیژی، ڕەنگدانەوەی ئەم جۆرە فشارەیە و بەدیاری دەخات کە چۆن ئەرکە

(1) هەڵوێستی قانوونی بەریتانیا و ئەمریکا لەم بارەیەوە ناکۆکە لەگەڵ قانوونی باوی زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان کە سزا دەسەپێنێ ئەگەر ئەو کارە نەکا.



ڕەوشتییە تازەکان دەکرێ تا ئەو ڕادەیە پێشکەون کە دانیان پێدابنرێ و دواتریش لە کاتی گونجاودا ببنە ئەرکی قانوونیی، چۆن ئەم ئەرکە قانوونییانەش لە ئاکامدا بەش بە حاڵی خۆیان لە بڵاوکردنەوەی هەست و پێوانە ڕەوشتییە مرۆڤایەتییەکاندا دێنە بەرهەم.

لەلایەکی تردا دەشێ هەندە بواری چالاکی مرۆڤایەتی هەبێ کە قانوون تێیاندا بە ئەنقەست لایەنگری حوکمێکی ئەخلاقی نەکات، چونکە قانوون هەست دەکات گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتیی زیاتر لەوەی کە مەبەستە قەدەغەی بکا سەرهەڵدەدا ئەگەر هاتوو قانوون خۆی تێهەڵقورتێنی. نموونەی ئەمەش لە سەردەمە تازەکاندا سزانەدانی زینا، یان خواردنەوە (سەرخۆشی) کە بە نهێنی ئەنجام بدابوونایە، لە هەندێ وڵاتاندا (هەندێ لە ویلایەتەکانی ئەمریکا) کە زینا بە تاوان و سەرپێچی ئەژمار دەکرێ، لە ڕاستیدا قانوون پیتێکی مردووە، لیژنەی وەلفندن welfenden committee لە ڕاپۆرتێکی بڵاوکراوەیدا لە ساڵی ١٩٥٧ لە بارەی تاوانی (نێربازی) لە نێوان ئەو نێرینانەی لە ١٨ ساڵ بەسەرەوەن و بە ڕەزامەندی و نهێنی ئەنجام دەدرێت، دەدوێ و جەخت لەسەر نەهێشتنی ئەم دەقە لە قانووندا دەکاتەوە و لەمەشدا پشت بەو قەناعەتە دەبەستێ کە لەو باوەڕەدایە پراکتیزەکردنی ئەم جۆرە قانوونە زۆر سەختە، ئەگەر پراکتیزەش بکرێ دوور نییە زیانی لە سوودەکانی زێتر بێ و بدکاری زێتری لێبکەوێتەوە وەکو قاچاندنەوە، هەروەها پشت بە بیانوویەکی ئەبستراکت تر دەبەستێ لە بارەی دەستێوەردانی قانوون لەو جۆرە حاڵەتانەدا و پشتیوانی لەو بۆچوونەی (جۆن ستیوارت میل) دەکات، واتە پشتیوانی ڕێبازی ئازادی و دەستێوەرنەدان بەو مانایەی کە پێویستە قانوون دەست لەو کارانە وەرنەدا کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری ڕەوشتی تایبەتەوە هەیە زیاتر لەو سنوورەی کە پێویستە بۆ پاراستنی سیستەمی گشتی و هاووڵاتیان لە دژی شتە زیانبەخش و دوژمنکارەکان. بە واتایەکی تر هەندێ ناوچە (بوار)ی ئەخلاقی هەیە باشتر وایە بۆ ویژدانی تاکەکەس بەجێبهێڵدرێت وەکو ئازادی

بیرکردنەوە و ئازادی بیروباوەڕ. ئەم تیۆری ئازادییە کەوتە بەر رەخنە، چونکە قانوونی سزاکان لە کاراییدا پشت بە ئاوێتەبوون بە ئاستە رەوشتییەکانی کۆمەڵ دەبەستێ و، سەرنەکەوتن لە دەربڕینی ئەم ئاستانە، دەسەڵاتی ئەخلاقیانەی قانوون و ئەو کۆمەڵەی، قانوون پشتیوانی دەکا لاواز دەکات، بەم شێوەیە راپۆرتی لیژنەی وەلفندن وەسفی ناتەوانی لە دانپیانان بەم پێداویستییە پێویستە دەکات (وەك هەڵەیەك لە زانستی قانوون)، بەڵام کاتێ مرۆ هەڵوەستەیەك دەکا و دەپرسێ چۆن ئەم پێوانە رەوشتیانە دەکرێ بێنە دی؟ ئەوا وەڵامەکەی ئەوەیە:

پێویستە پەنا بەرینە بەر ئەوەی قانوون ناوی دەنێ (پیاوێکی ئاسایی ژیر) واتە ئەو پیاوە، یان ئافرەتەی لەو شوێنە دانیشتووە کە بۆ دەستەی سوێند داراون تەرخانکراوە،، یان هەروەکو بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی ناو نراوە (ئەو پیاوەی لە ئوتۆپاسدا دانیشتووە) ئەم وەڵامەش بە وەڵامێکی کەمتر لە ناشیاو دەچێ جا ئەم ئولگو خەیاڵییە هەتا ئەگەر هەشبێ لەوانەیە تێکەڵەیەك حەز و نەزانی و ململانێی یاخیبوو بێ، هەتا ئەگەر تێڕوانینی مرۆڤێکی رەوشت باش بۆ هەندێ کێشەی رەوشتیی سادە وەك بنەما و پێودانگ دەست بدەن (ئەمە ئەگەر رەوشت سادەبێت) راستییەکەی ئەوەیە کە زۆر پرسیار هەن پێویستییان بە ئاستێکی مەعریفی فراوان و توێژینەوەی سەخت و بەهۆکردنی چڕ هەیە کە ئاسان نییە پێشبینی بکرێ لەلای ئەندامێکی سادەی دەستەی سوێنددراوان.

## سروشتی (دڵڕەقی) وەك هۆیەکی تەڵاق

دەکرێ نموونەیەکی ئامادەکراوی ئەم جۆرە سەختییە لە قانوونی تەڵاقی نوێدا بخەینە بەرچاو، ئەوەتا قانوونی ئینگلیزی بۆ نموونە مافی داواکردنی تەڵاق دەداتە هەردوولا بە مەرجێ هەریەکێکیان بۆ دادگا بسەڵمێنێ کە لایەکەی تر تاوانبارە بە دڵڕەقی،



جا لەوانەیە دڵڕەقی لە رووکاردا بە سادە بێتە بەرچاو، بەڵام دادگاکان دووچاری سەختییەکی زۆر هاتوون لە لێکجیاکردنەوەی نێوان ئەو رەفتارەی بە ئاسایی دەژمێردرێت لە ژیانی هاوسەرێتیدا، لەگەڵ ئەو رەفتارەی مەترسیدارە و پاساو بۆ تەڵاق دێنێتەوە، دادگاکانی بەریتانیا زۆر جاران جەخت لەسەر ئەو مەسەلەیە دەکەنەوە کە ئایا لایەنی تاوانبارکراو بە دڵڕەقی (با بڵێین مێردە نەك ژنە) بە ئەنقەست و بە ویستی خۆی ئەو رەفتاری کردووەو بە مەبەستی ئازاردانی ژنەکەی بووە، یانەکو تەنها دەڵێ (ئاوا رەفتاری کردووە، رەچاوی نەکردووە، ژنەکەی تەحەمولی بکات).

ئەم کارە ئاسانە کاتێ مێرد بە شێوەیەکی دوژمنکارانە بەرانبەر ژنەکەی رەفتار بکات وەك ئەوەی لێی بداو ئازاری بدا، یان زەلیلی بکا، یان ژیانی لێ ناخۆش بکا، بەڵام چار چییە کاتێ مێردە لە ژنە نەدا، یان دڵڕەق نییە، بەڵکە سست و ناکارایە و هیچ شتێك ناکا تاوەکو یارمەتی ژنەکەی بدات، بە شێوەیەك تەواوی قورسایی بەخێوکردنی خێزان بکەوێتە ئەستۆی ژنەکە و لە ئەنجامدا نەخۆشکەوێ؟

یا گریمان ژنەکە درەنگ لە خەو بە ئاگا دێت و تەواوی ئەرکەکانی فەرامۆش دەکا و ژەمەکانی خواردن بۆ مێرد و منداڵەکانی ئامادە ناکا و بێ باکانە و بە شێوەیەکی ناشیرین رەفتار دەکات، بێ ئەوەی مەبەستی بێ ببێتە هۆکارێك بۆ نەساغی و بەدبەختیی مێردەکەی، چونکە بە شێوەیەکی سادە ئەمەیە خووڕەوشتی ژنەکەی، جا دەکرێ بڵێین ئەم مێردە، یان ئەو ژنە بە دڵڕەقی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا رەفتار دەکات؟ ماوەیەکی چاك دادگاکانی بەریتانیا بەپێی ئەو رایە کاریان دەکرد کە دەڵێ: ئەو رەفتارەی مێرد پێویستە بە ئەنقەست و مەبەستی ژنەکەی بێت، واتە دەبوایە بزانێ کە رەفتارێکی ئاوا لەوانەیە کاریگەری ترسناکی هەبێ لەسەر باری تەندروستی ژنەکەی، بەڵام ئەنجوومەنی لۆردان بەم دواییانە بڕیاریدا کە مەرج نییە لە کێشەکانی دڵڕەقیدا مێرد نیازی ئازاردانی ژنەکەی بەدیار بخات، بەمەش دان

بەوەنرا کە ئامانجی سەرەکی لە قانوونی تەڵاق، پاراستنی لایەنێکە لە رەفتاری تەحەمول نەکراوی لایەنەکەی تر، جا پێودانگی دڵڕەقی لەوەدا دەبێ کە رەفتارەکە هێندە خراپە ناکرێ داوا لە لایەنەکەی تر بکەین تەحەمولی بکات، هەر کاتێکیش ئەم تەرزە رەفتارە سەلمێنرا، گرنگ نییە ئاراستەی لایەنەکی تر کرابێت، یانەکو دەرەنجامی بێ باکی، یان خۆپەرستی، یان تەمبەڵی بووبێت!

لەوانەیە هەندێ کەس وا هەست بکەن دەربازبوون لەم سەختیە ئاسانە بەوەی مەسەلەکە بۆ دادوەر لێگەڕێین کە بڕیار دەدا لە هەر کێشەیەکدا دڵڕەقی هەبووە، یان نا، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەمە بەشێکی چارەسەکردنەکەیە، هەر ئەمەش پوختی بڕیارە دەرچووەکانی دادگایە لە زۆرینەی حاڵەتە پێکچووەکاندا.

بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە یەکێ لە ئامانجەکانی سیستەمی دادوەری ئەوەیە هەوڵبدا تا ماوەیەکی درێژخایەن حوکمی گشتی چوونیەك لە کێشە پێکچووەکاندا لە رووی جۆرەوە، بهێنێتە دی و تێبکۆشێ لە رێگای تاقیکردنەوەو بەڵگەی ژیرانە کە دەکرێ بە هۆیانەوە، ئەم ململانێیە چارەسەر بکرێت، دەشێ ئەو دەرەنجامەی ئەنجوومەنی لۆردان پێی گەیشت جێگەی هەندێ رەخنە بێت، بەڵام ئاماژە بەوە دەکا کەوا دادگاکان لە رێگای پراکتیزەکردنی هەمەلایەنی بەڵگە جیاجیاکان بەسەر ئەو کێشانەی لەبەردەستیاندایە دەتوانن پرەنسیپی ژیرانە دابنێن کە دەشێ بەسەر کۆمەڵێك حاڵەتی جیاوازدا پراکتیزە بکرێن و بەشێکی بەرچاویش لە دادوەری بهێننە دی، بەم شێوازە کۆمەڵگە بە کەرەستەی ژیرانەتر و چڕتر پشت ئەستوور دەبێ کە دەتوانین وا لە قانوون بکەین پەیوەندیدار بێ بەو پێداویستییە رەوشتییانەی کە هەن، لە جیاتی ئەوەی لێیگەڕێین هەر حاڵەتێك بەپێی تێگەیشتن و درککردنی ئەندامێکی دەستەی سوێنددراوان چارەسەر بکرێ.



ناکرێ ریفۆرمی قانوون دیرۆکێکی زۆر پڕشنگداربێ ئەگەر نەتوانرا هیچ جوولەیەك، یان ئیجرائاتێك ئەنجامدرێ، هەتا ئەگەر ئەم جوولەیە پەسندیش بێت، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە هەستی گشتی لە بەرژەوەندی ئەم گۆڕانەدا شارژ بکرێتەوە ئەگینا دەسەڵاتی قانوون لاواز دەبێت، لە راستیشدا لە رێگەی گۆڕینی خودی قانوون، دەکرا دووبارە رای گشتی فۆرمالیتە بکرێتەوە بەرەو تێڕوانینێکی رووناکتر، گومانیش لەوەدا هەیە ئەو حاڵەتە زۆرانەی کە تیایاندا سزای سێدارە جێبەجێ دەکرێ کەمتر بێتەوە، تاوەکو لە پێشدا زۆرینەی گەل گەرانتی نەکرێت.

## کێشەی (تۆماری خاتوونان)

ئەوە رایەی کە دەڵێ پێویستە پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان قانوون و پێودانگەکانی رەوشتی باودا هەبێ رایەکە لە دەرەنجامە عەمەلییەکاندا پێویستمان پێی نابێ. جا لەو کێشەیەدا کە بە (کێشەی دەلیلی خاتوونان) دەناسرێتەوە دەزگایەکی بڵاوکردنەوە نامیلکەیەکی بڵاوکردبووەوە ناونیشان و ژمارە تەلەفۆن و زانیاری لە بارەی هەندێ سۆزانی تیابوو، بەوە تاوانبارکرا کە پیلانی بۆ گەندەڵکردنی رەوشتی گشتی گێڕاوە، لە ئاکامدا ئەنجوومەنی لۆردان حوکمی تاوانبارکردنەکەی پەسندکرد و بە هەمان شێوەش دادوەران رۆڵی دادگایان وەك پاسەوانێکی رەوشتی گشتی پەسندکرد بەو پێیەی ئەرکی دادگا پاراستنی بەرژەوەندیی رەوشتییانەی دەوڵەتە، ئەنجوومەنی لۆردان تیشکی خستە سەر ئەو رۆڵەی کە دەکەوێتە ئەستۆی دادگەری لە روونکردنەوەو لێکجیاکردنەوەی تاوانە نوێیەکان بەپێی پێداویستییەکانی رەوشتی گشتی کە دەشێ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازبن، ئەو رۆڵەی کە تەشریعی قەزائی لە قانووندا دەیبینێ دەبێتە جێ باسی دواترمان، چونکە لایەنێکی زیندووە لە لایەنەکانی ئەرکی قانوون بە

هەموو لایەنەکانییەوە. بە تایبەت لە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوودا، کێشەی (دەلیلی خاتوونان) ئاکامی ترسناکی لێکەوتەوە لە بواری ئازادی و حوکمی قانووندا، ئەمەش لە بەشێکی دواتردا باس دەکەین کاتێ دێینە سەر باسی پەیوەندیی قانوون بە ئازادییەوە، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بەم کێشەیەوە هەیە، لێرەدا تەنها ئاماژە بەوە دەکەین کە دڵنیابوون لە پێداویستییەکانی ڕەوشتی گشتی لە چرکەیەکی دیاریکراودا بەو دادپرسە (قاضي) سپێردرا کە لە کێشەکە دەکۆڵێتەوە، بەپێی ئوسوڵی بەریتانی، دادپرسی دادگا پێشوەخت باسی قانوون دەکا بۆ دەستەی سوێنددراوان، هەوڵدەدا قەناعەتی خۆی ڕابگەیەنێ سەبارەت بەوە کە چی کرۆکی ڕەوشتی گشتی باو لە کۆمەڵگەدا پێکدێنێ، پێمانوانییە ئەمەش هۆکارێکی نموونەیی بێت بۆ پێشخستنی قانوونی سزاکان، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو دادپرسانەی لە زۆر حاڵەتدا قانوونی دادگەرییان (التشريع القضائي) ڕەتدەکردەوەو، پێیانوابوو هۆکارێکە بۆ (زەوتکردنی دەسەڵاتی قانووندانەر) زۆر بە ڕێزەوە ئەرکی ئافراندنی تاوانی نوێیان دەگرتە ئەستۆ لە ڕێگەی ئەو حوکمە دادگەرییانەی پێیدەگەیشتن بە پشتبەستن بەو دەرەنجامانەی سوێنددراوان بەپێی ئەحکامەکانی ڕەوشتی گشتی پێیدەگەیشتن.

## تاوان و سزا

سەختی و دژواری ڕێککەوتن لەسەر داوا ڕەواکانی ڕەوشت لە هەندێ نێوەندندا بووە هۆی دروستبوونی کاردانەوەیەك کە لە بەرژەوەندی هەوڵی دوورخستنەوەی فەرمانە ڕەوشتییەکانە لە قانوونی سزاکان تاوەکو بپرژێتە سەر بەدیهێنانی ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی کە بریتین لە پاراستنی کۆمەڵگە و چاکسازی زیندانیکراو لە



جیاتی ڕاکردن بە دوای ئامانجی تاوانبارکردنی زیندانیکراو، دیاریکردنی ئاستی بەرپرسیارێتی ڕەوشتیانەی لەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە.

گوتراوە کە دیارکردنی پلەو ئاستی بەرپرسیارێتی ڕەوشتیانە سەبارەت بە ڕەفتاری هەڵە کارێکە لە سەرووی توانای مرۆڤەوەیە، ئەگەر ئەرکی قانوونیش تەنها ئەو ئامانجە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوانەبێ کە دەتوانێ جێبەجێیان بکا ئەوا بەشێکی زۆری ئەو پەشۆکانەی هەنووکە پەیوەندییان هەیە بە بابەتە "کیدی"یەکانی تاوان و سزا لەبەرچاوان نامێنێ.

هەڵبەتە ئەوەش وەڵامدانەوەی ئەو ڕایە نییە کە دەڵێ ئامانجی قانوونیی لە دڵنیابوون لەوە کە ئاخۆ کەسێك تاوانێکی دیاریکراوی کردووە، حوکمێکی قانوونیی بەخۆوە دەگرێ، واتە ڕەفتارێکی کردووە دەکەوێتە ناو چوارچێوەی پێناسەی قانوونیی تاوان، چونکە ئەمە پەردە لە ڕووی سێ لایەنی زیندوودا لادەدا کە قانوون و ڕەوشت تیایاندا دووچاری پێکدادان دەبن:

**یەکەم:** بیرۆکەی (تاوانکاری) هەر هەمووی لە قانوونی سزاکاندا بەندە بە بیرۆکەی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی و بەم شێوەیەش ڕەوشت، دەسەڵاتی قانوون و ئەرکی گوێڕایەڵیکردن بۆ فەرمانەکانی قانوون سەقامگیرتر دەکا.

دووەم: بەرپرسیارێتی لە قانووندا بە شێوەیەك تاوتوێی لەگەڵدا دەکرێت کە بەرپرسیارێتی تاوانکاری نامێنێ، ئەگەر هەندێ هەلومەرجی پاساوهەڵگر بێتە ئاراوە کە وامان لێبکا حوکم بەسەر تاوانبارکراودا بدەین کە لە ڕووی ئەدەبییەوە لەو کردارە بەرپرسیار نییە کە تاوانەکە پێکدێنێت.

جا لەوانەیە تاوانبار شێت بێ کە فام ناکات هەڵەیەکی کردووە، بۆ نموونە کەسێك پۆلیسێك بکوژێ لە ژێر باری وەهمێکی شێتانە کە پێی وابێ پۆلیسەکە سەربازێکی بێگانەیە و بەشدارە لە هێرشێکی چەکدارانە بۆ سەر نیشتمانەکەی،،

یانەکو بە زۆر ناچارکرابێ کارێکی وا بکا، یان وایکردبێ لە حاڵەتێکی نادیار، یان لە کاتێکدا لەسەر هۆشی خۆی نەبووبێ، حیکمەت لەمەدا ئەوەیە کە بەرپرسیارێتی تاوانکاری، توخمێکی ژیریی بەرپرس دەگرێتەخۆ کە (پارێزەران ناوی دەنێن ژیرێتی تاوانکاری). کاتێ رووداوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە تاوانبار ئەو کەسە ژیرە نییە، ئەو کاتە لەو بەرپرسیارێتییە قانوونییە دەبەخشرێ، ئەم بنەمایەش هەلاوێردەی خۆی هەیە، بۆ نموونە ئەو تاوانانەی کە مرۆڤ بە رەهایی بەرپرسیارێتی قانوونیی دەکەوێتە ئەستۆ جا لە هەر بارێکی ژیریدا بێت، بەڵام ئەمەش بە گشتی ناسەپێ تەنها بەسەر ئەو تاوانانەدا نەبێ کە تا رادەیەك سادەن، لە بڕیارێکی ئەم دواییەی ئەنجوومەنی لۆرداندا هاتووە: دەشێ کەسێك بە تاوانی کوشتن تاوانبار بکرێ ئەگەر هاتوو بە شێوەیەك لەگەڵ زۆرلێکراودا رەفتاری کردبوو، کە لە توانای پیاوێکی ئاساییدا بوو بزانێ ئەم جۆرە کارانە ئازاری ترسناك بە زۆرلێکراو دەگەیەنن، باری ژیریی تاوانباریش لە درککردنی ئەو زیانەی کە بە کوژراوی دەگەیەنێ هیچ بەهایەکی نابێ، ئەم بڕیارە لە بەریتانیا و دەرەوەیدا، رەخنەیەکی زۆری نایەوە، چونکە پێویستی سەلماندنی بەرپرسیارێتی کەسایەتیی تاوانبار دەشێوێنێ.

خاڵی سێیەم: کە رەوشت و بەرپرسیارێتی قانوونیی تیایدا پێکدادەدەن باس لەو سزایە دەکا کە پێویستە بسەپێت، لەمبارەیشەوە گوتراوە کەوا دوورخستنەوەی بیرۆکەی بەرپرسییارێتی ئەخلاقی لە تاوان زەمینە بۆ دروستبوونی سیاسەتێکی سزایی ژیرانەتر دەڕەخسێنێ کە باشتر کار دەکا لەو بەرنامە و میتۆدەی ئێستا دادگاکان پەیڕەوی دەکەن و بایەخ بە فاکتەرێك دەدا کە ناکرێ بە هەند هەڵبگیرێ ئەویش پلەی مەعنەویی تاوانکارییە، هەرچەندە ئەمە مشتومڕێکی سەرنجراکێشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ جێگەی لاری بێت، چونکە ئەو توخمەی کە قانوون گەرەکیە تاوەکو دەسەلاتی رەهای خۆی هەبێ و پاڵپشتی ئەو قەناعەتە مەعنەوییەی پێ بکا لەلای کۆمەڵ فەرامۆش دەکا، (قوتابخانەی ئەخلاقی زیاد لە



پێویست پێدادەگرێ لەسەر ئەم توخمە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم توخمە بایەخێکی مەزنی هەیە لە کارەکانی دەزگای قانوونییدا).

سەرەڕای ئەمە ئاسان نییە ببینین کەوا چۆن دەکرێ بیرۆکەی بەرپرسیارێتی رەوشتەکی لە مەسەلەی تاوانکاری قانوونیی، سەبارەت بەو تاوانەی کە دەخرێتە پاڵ تاوانبارکراو، دووربخرێتەوە بێ ئەوەی بنەماکانی بەرپرسیارێتی ژیری بە تەواوەتی لە ریشەوە هەڵنەکێشین لە تاوانەکەدا لە جیاتیشیدا لێکۆڵینەوە ئەنجامدەین لەو بارەیەوە کە ئایا تاوانبارکراو بەو کارانە هەڵساوە، جا ئەگەر وەڵامەکە پۆزەتیڤ بێ، پێویستە بپرسین باشترین رێگاچارەی کۆمەڵایەتی کامەیە کە بەسەر ئەم کێشەیەدا پراکتیزە ببێ؟

زۆر پێناچێ ئەمە ئەلتەرناتیڤی ئەو بنەما رەوشتییانە بێ کەوا قانوونی سزاکان پشتیان پێ دەبەستێ (لە سایەی باری ئێستای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا)، یان ئەوەبێ کە لەلایەن تەواوی کۆمەڵگە پەسەند بکرێت، یانەکو لەلایەن خەڵکی سادەوە لەگەڵ مانای داد بگونجێت، ئەو مانایەی پراکتیزەکردنی قانوون بە شێوەیەکی کارا پشتی پێ دەبەستێت.

رەنگە بگەینە رێگاچارەیەکی ناوەنجی ئەمەش بە هێشتنەوەی بیرۆکەی تاوانکاری و بەرپرسیارێتی و پەیوەندی هەردووکیان لەگەڵ بە کردەوە ئەنجامدانی تاوان و دوورخستنەوەی لە بیرۆکەی سزا، لەم حاڵەتەدا دادگا لە توانایدا دەبێ خۆ دوور بگرێ لەوەی بە چڕی بپرژێتە سەر ئەرکێکی بۆغزێنراو، هاوکات پلەی بەرپرسیارێتی رەوشتەکی سەبارەت بە کاریگەریی سزا لە سەر کەسی تاوانبارکراو دەستنیشان بکا بە لەبەرچاوگرتنی شیکردنەوەی سایکۆلۆژی ئەگەر لەبەر دەستدابوو، هەروەها ئەوەش دیار بکا کە تا چ رادەیەك دەکرێ سوود لە سزا وەبگرێت، دەبێ گومانیش لەوەدا نەبێ کە ئەم شێوازە بڕای بڕا مانای ئەوەیە

ئەگەر هاتوو سەلمێنرا کە تاوانبارێك لە توانایدا نەبوو سوود لە سزا وەربگرێ ئەوا هەر دەبێ ئازاد بکرێ، چونکە لەسەر دادگا پێویستە بابەتی پاراستنی کۆمەڵ لەبەرچاو بگرێ، هەروەکو ئێستا وا دەکا، ئەگەر دەرکەوت حاڵەتی ئازادکردنی تاوانبار ئەندامانی تری کۆمەڵگە دەخاتە مەترسیەکی جیددیەوە، ئەوا لەسەر دادگا پێویستە فەرمانی گرتنی بدا، لێرەوە ئازادکردنی زیندانی لە ئاکامدا بەندە بەوەی چیتر مەترسی لەسەر کۆمەڵگە دروست نەکا، ئەمەش حاڵەتێکە هاوشێوەی حاڵەتی تاوانکارە شێتەکانە لە سایەی سیستەمی ئێستادا.

جا ئەگەر سیستەمێکی ئیجرائاتی تاوانکاری وەك ئەمە خرایە کار و دەرکەوت کە بەسەرکەوتوویی کار دەکا بێ ئەوەی بەرژەوەندی گشتی بخاتە بەر مەترسییەکی مەزنتر لەوەی کە ئێستا دووچاری دەبێت، ئەوا رۆڵێکی پەروەردەیی و رۆشنبیری دەگێڕێ لە نێو جەماوەردا، هەتا بەرە بەرە لە رووی ژیریشەوە پێشکەوێ، درك بکا کە قانوونی سزاکان بە تەواوی دەبێتە سیستەمێکی گەڕان بە دوای راستییەکان لەهەر تاوانێکدا بە جیا و پشکنینی باکگراوندی کۆمەڵایەتی و ژیری تاوانبار، بێ ئەوەی هەرگیز پەنا بەرینە بەر بیرۆکەی بەرپرسیارێتی، جا ئەگەر بەم شێوەیە بێت ئەوا بیرۆکەی (ئایدیای) بەرپرسیارێتی بەرە بەرە ون دەبێت، یاخود رێگەی ونبوونی بەرەبەرەیی بۆ خۆش دەکرێت هەروەکو (باربارا وتن Barbara Wooteon) پێی وابوو، بەڵگەشمان بەدەستە کە بزاڤێك لە ئارادایە بەرەو ئەم رێبازە لە هەندێ لە وڵاتە سۆسیال دیموکراتە پێشکەوتووەکان بە تایبەتیش وڵاتانی ئەسکەندینافی، دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە ئەم چارەسەرکردنە پشت بە ژمارەیەك گریمانە دەبەستێ کە هێشتا نەسەلمێنراون، وەکو توانای پزیشکیی سایکۆلۆژی نوێ لە بەشداریکردنێکی بنەڕەتی لە دووبارە بونیاتنانەوەی تاوانباران و لادەرە کۆمەڵایەتییەکان، کەسانێکی زۆریش وای بۆ دەچن مەترسییە شاراوەکانی دوورخستنەوە یاخود بەکەم هەڵگرتنی



هەستکردن بە بەرپرسیارێتی رەوشتی تاکەکەس گەورەترن لەو کەموکورتییەی لە سیستەمی ئێستادا هەن.

## ململانێی نێوان قانوونی دانراو و قانوونی رەوشتەکی

هەروەکو لە پێشدا بەدیارکەوت قانوون و رەوشت تێکهەڵکێشراون بە شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز یەکیان پشت بەوەی تریان دەبەستێ، سەرباری ئەوەش هێشتا دەشێ ناکۆکی جیددی سەرهەڵبدا لە نێوان ئەو ئەرکەی قانوون و رەوشت لە حاڵەتێکی دیاریکراودا دەیسەپێنن، لە پێشدا بینیمان کەوا دەکرێ پەیڕەوی سێ بۆچوونی سەرەکی بکەین لە کاتی روودانی ئەم جۆرە ناکۆکییە کە دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە پوختیان بکەینەوە:

یەکەم: دەشێ بڵێین پێویستە قانوون و رەوشت بەیەکەوە هەڵبکەن و بگونجێن، یان لەبەرئەوەی کەوا قانوونی رەوشتەکی، ناوەڕۆکی راستەقینەی قانوونی مرۆڤی دادەڕێژرێت هەروەکو لە حاڵەتی لاهوتی عیبری (کەلفانی)یدا، یاخود رەوشت بۆ خودی خۆی ئەوەیە کە قانوون بڕیاری لەسەر دەدات.

ئەلتەرناتیڤی یەکەم بەرەو ئەو گریمانەمان دەبا کەوا قانوونی رەوشتەکی بە تەنها خۆی دەسترۆیە، هەر شتێکیش لەگەڵ رەوشت نەگونجێ لە رووی قانوونەوە پابەندکار نییە.

ئەلتەرناتیڤی دووەم ئەوەیە کە ژمارەیەك لە فەیلەسووفان بانگەشەیان بۆ کرد، لەوانەش (تۆماس هوبز Thomas Hobbes) بۆ نموونە دەڵێ:

مانای رەوشتی راستەقینە جگە لە گوێڕایەڵی بۆ قانوون هیچی تر نییە، تەنانەت (قانوونی نادادوەر)یش هەڵەیەکە لە گوزارشت کردندا، هەروەها تیۆری (هیگڵ Hegl)یش کە تیۆرێکی ناڕۆشنە لە بارەی باڵادەستی رەوشتییانەی دەوڵەت بەسەر

تاکەکەسدا دان بەوەدا دەنێ کە تاکەکەس ناتوانێ داوای مافێکی گەورەتر لە مافی خۆی بکا سەبارەت بە گوێڕایەڵی قانوونی ئەو دەوڵەتەی کە خۆی بەشێکی شایانی باس نییە تیایدا.

بۆچوونی دووەم: دان بەوەدا دەنێ کە هەریەکە لە قانوونی دانراو و قانوونی ڕەوشتەکی ناوچە (بوار)ێکی دەسەڵاتی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام قانوونی ئەخلاقی قانوونێکی باڵاترە، بەمەش قانوونی ڕەوشتەکی پێودانگێکە بۆ ئازمایشکردنی تواناکانی قانوونی دانراو، لەبەر ئەمە ململانێیەکە دەبێ بە لایەنی کەم لە کۆتاییدا لە بەرژەوەندی قانوونی ڕەوشتەکی یەکلا بکرێتەوە، ئەگەرچی ئەنجامەکانی ئەم چارەسەرکردنە زۆر جیاوازن، بۆ نموونە لە کاتی ناکۆکیدا لەوانەیە بگووترێ قانوونی دانراو پووچەڵە و کاری پێناکرێ بەمەش هاووڵاتی ئەرکی پابەندبوونی ڕەوشتیانەی سەبارەت بە گوێڕایەڵیی قانوونی لە ئەستۆ نامێنێت. لەلایەکی تردا لەوانەیە بگووترێ دەبێ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە بکەوێتە نێوان خودا و فەرمانڕەوای زۆردارەوە، ئەرکی هاووڵاتیش تەنها گوێڕایەڵییە، ئەوەی کە ڕۆشنە لێرەدا ئەوەیە کە زۆر گۆڕانکاری تر هەن لەوانەیە لە کاتی جیاوازتردا خرابنە ڕوو لەگەڵ بەدیارخستنی شتێ لە لۆژیك، یان لە دەسەڵات چ زیاد بێ چ کەم، هەرچۆنێ بێ ئەوا تیۆری هەردوو قانوون بە گشتی لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە تا ئێستا خراوونەتە بەرباس، لە زانستی (فقه)ی خۆرئاواشدا لە ژێر ناونیشانی قانوونی ڕەوشتەکی، یان (قانوونی سروشتکرد) کە کۆمەڵێك پرەنسیپی سیستەمێکی باڵاتر دەگرێتە خۆ چ لەلایەن خوداوە سەپێنرابن، یان بەشێك بووبن لە سیستەمی سروشتی جیهان ئەم چەمکە لە میانی سەردەمە جیاجیاکاندا، بە تایبەتی لە سەردەمی نوێدا، بەستراوەتەوە بە بیرۆکەی مافە سروشتییەکانی مرۆڤ کە ڕۆڵێکی مەزنیان هەبووە لە بیری دیموکراسی لە سەردەمی هەردوو شۆڕشی فەڕەنسا و ئەمەریکاوە تا ئێستا.



ڕێگای چارەی سێیەم: ئەوەیە کە باس لەسەربەخۆیی هەردوو بواری قانوون و ڕەوشت دەکا لەسەر بنەمای تایبەتمەندێتی، بە شێوەیەك کە هیچ کامیان ناتوانێ چارەسەری مەسەلە قانوونییەکان بکا تەنها ئەو مەسەلانە نەبن کە دەکەونە سنووری تایبەتی خۆیانەوە، بەم تیۆرەش دەگوترێت تیۆری (الوضعية القانونية) کە دەڵێ ڕەوایی (شرعية) هەر حوکمێکی قانوونیی بەندە تەنها بە پێودانگی ڕەواوە، هەروەها ڕەوایەتی ڕەوشتیش بە تەواوەتی پێدادەگرێ لەسەر پراکتیزەکردنی ئەم پێودانگانە بەسەر سیستەمێکی ڕەوشتی دیاریکراودا، پەیڕەوانی ئەم ڕایە شوێنێکی (عەمەلی) لە قانوونی سروشتدا دەگرن و پشت دەبەستن بە پرەنسیپی سوودخوازی، یان گونجاندن یاخود عورف، یانەکو عادەتە کۆمەڵایەتییەکان، بە ڕای ئەوان ململانێیەك لە نێوان ئەم دوو بوارەدا ناتوانێ تانووت لە ڕەوایەتی قانوونیی دانراو بدات، یان ئەرکی گوێڕایەڵیی قانوون بگۆڕێ، گەرچی مەسەلەیەکی ڕەوشتی دەورووژێنێ ئەویش ئەوەیە کە ئایا پێویست بە گۆڕینی قانوون دەکا! لە هەندێ حاڵەتی ترسناکدا ململانێی نێوان ئەرکی قانوونیی و ئەرکی ڕەوشتەکی دەکرێ لە ڕووی ڕەوشتییەوە چارەسەر بکرێ بەپێی ئەوەی کە ویژدان و ئازایەتی ڕەوشتییانەی تاکەکەس دەیسەپێنێ بە ڕاوەستان لە ڕووی قانوونێك کە لەو باوەڕەدایە ناکۆکە لەگەڵ داد، یان لەگەڵ حەقدا.

# قــانوون و عــــــورف

تا ئێستا باسی قانوونمان دەکرد لە دەوڵەتانی تازەدا، واتە وەکو کۆمەڵێك پرەنسیپ کە هێزی پابەندبوونی راستەوخۆی یان ناراستەوخۆی لە یەکێ لەو دەزگایانەی دەوڵەتەوە وەردەگرێ کە بەپێی دەستوور دەسەڵاتی قانووندانانی پێسپێرراوە. کۆمەڵێ لە زانایانی قانوون، لە نێوانیشیاندا (ئۆستن)، بایەخی تایبەتیان دایە ئەم شێوازە سیستەمەی قانوونو لەو باوەڕەدابوون پێودانگەکانی کۆمەڵگا بەراییەکان لە ڕووی شێوازەوە جیاوازن لەو پێودانگانەی لە سایەی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا گەشەیانکردووە، بەشێوەییێك شایستەی ئەوە نین، بگەنە ئاستی قانوون یاخود لە (ئەلتەرناتیڤێکی بەرایی قانوون) هیچی تر نین. لێرەشدا هیچ شتێ نییە رێگە لە زانایان بگرێ لەوەی بابەتەکانیان دیار بکەن و پێناسە و پۆلکاری بکەن بە هەر شێوازێ بیانەوێ. ئیدی لەوانەیە حەز بکرێ، لە پێناو هەندێ ئامانجی دیاریکراودا، جیاوازی بکرێ لە نێوان ئەو سیستەمە بەراییانەی کە مرۆڤایەتی ناسیوونی لە قۆناغە جیاجیاکانی پێشکەوتنیدا. لەوانەشە هەندێ هۆی بەجێ هەبن کە حەز نەکرێ بەراورد لە نێوان حوکمە پەیوەستەکانی کۆمەڵگا جیاوازەکاندا بکرێ، وەکو کۆمەڵگاکانی دانیشتوانی جەنگەڵەکانی ئوستورالیا و (بۆشمەن- Bushman)، کۆمەڵگەی یۆنانی لە سەردەمی هۆمیرۆسداو، کۆمەڵگەی فیودالّی ئەوروپا لە چاخەکانی ناوەڕاستداو، کۆمەڵگەی تازە لە بەریتانیا و فەڕەنسەدا. مەسەلەی پۆلکاری تاڕادەیەك مەسەلەی هەڵبژارتنە، تا ئەو کاتەی لە زەینماندا وا تێبگەین



کە هەڵبژاردن بە تەواوەتی کارێکی زۆرەملێ نییە، بەڵکو پابەندە- هەروەکو لە هەر سیستەمێکی دیکەی پۆلکاریدا- بە درککردنی تەواوی تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی شێوازە هەمە جۆرەکان و ئەوانەی لەگەڵیاندا ناکۆکن. ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە هەتا بکرێ بە گیانێکی زانستییانە، دەبێتە هۆی هەبوونی توخمێکی هەڵسەنگێنەر لە حوکمداندا، چونکە لە کۆتاییدا پێویستە لەسەر گرنگی رێژەیی لێکجیایی و پێکچووندا بڕیار بدەین، رێك وەکو بایۆلۆژیستێك کە کیانی بەراوردکاریی جۆرە جیاوازەکانی هەڵدەسەنگێنێ، تاکو بڕیاربدا کە ئایا (نەهەنگ- whale) ماسییە یاخود شیردەرە. ئەرکی زانای رەگەزە سروشتییەکان ئەوەیە کە ئەو تایبەتمەندییانەی دەستنیشان بکا کاتێ مامەڵە لەگەڵ پەیکەرە ئێسقانییەکانی سەدەکانی یەکەمدا دەکا تاکو بزانێ کە ئایا پەیکەری مرۆڤە یانەکو پەیکەری هاوشێوەکانی مرۆڤن. هەروەها ئەم پۆلکارییانە پووچەڵ نابنەوە کاتێ بمانەوێ ئەو حوکمانە وا لێبکەین بەهاییێکیان هەبێ، بەمەرجێ پەیوەندییان بە لێکۆڵینەوەیەکی متمانەپێکراو و شیکردنەوەی ئەو دیاردەیەوە هەبێ کەوا سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەو هۆیانەیە کەوا دەکەن کۆمەڵێك بە باشتر بزانرێ لە کۆمەڵێکی دیکە. رێك ئەم خاڵە رەچاوکرا لە بواری پۆلکاری قانوونییدا کاتی توێژینەوەی قانوونی نێودەوڵەتی، چونکە سەرباری ئەوەی کە لەوانەیە لەگەڵ قانوونی نشتیمانیدا هاورەوت نەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هۆی بەجێ زۆرن بۆ ئەوەی هەردوو قانوون بخرێنە یەك گۆشە وەکو دیاردەیەکی قانوونیی. جیاوازی نێوانیان بەو مەبەستە دانەنراوە بە شێوەیەکی ئەفسووناوی ببێتە تراویلکە، چونکە ئەوەی کە دانیپێدانراوە ئەوەیە کە هۆی بەجێ هەن سەبارەت بە چارەسەرکردنی وشەی (قانوون) بە شێوەیەکی فراوان بە جۆری بەشی داپۆشینی هەموو ئەو جۆرە سیستەمانەی پێودانگەکان بکا کە بە شێوەیەکی پتەو بەیەکەوە گرێدراون ئەگەرچی وەکو یەکیش نەبن.

## بەراوردێك لە نێوان قانوون و عورفدا

کۆمەڵێ هۆ هەن وامان لێدەکەن هەستبکەین کە پێویستە پەیوەندی تێکهەڵکێشراوی نێوان ئەو پێودانگە قانوونییانەی کەوا لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا کاریان پێدەکرێ لەگەڵ ئەو شێوازە پێودانگانەی لە کۆمەڵگا بەراییەکانی سەرەتا رووبەڕوویان بووینەوە راڤە بکەین. سەرەتا دەڵێین زانایانی کۆمەڵناسی فێریانکردین کەوا قانوون لە زیاتر لە ئاستێکدا بوونی هەیە، هەتا لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانیشدا بێ، بۆ ئەوەش کە شۆڕبینەوە نێو سروشتی پێکهاتەی قانوون ئەوەندە بەس نییە کەوا بە تەنها ئاگاداری پرۆسەی بە دۆکیومێنتکردنی رێسا قانوونییەکان بین، بەڵکو پێویستە لەسەرمان لەو پێودانگە کۆمەڵایەتییانە تێبگەین کە گەلێ لە ئەرکەکانی قانوون دەستنیشان دەکەن، هەر ئەمەشە کە (ئارلیش) بەقانوونی زیندووی کۆمەڵگا وەسفی دەکا، بەهەمان شێوە پێویستە لە دیاردەی دەوڵەتی پێشکەوتوو تێبگەین کە خودان دەزگای ئاساییە بۆ دارشتنی قانوونەکان و، بەدەگمەنیش لە دیرۆکی رۆشنبیری مرۆییدا سەریهەڵداوە، ئەگەرچی بینیمان لە تەواوی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا تەنانەت بەرایی و دوورە پەرێزەکانیشدا کۆمەڵێ پێودانگ رەفتاری نێوان کەسان رێکدەخاو هەمووشیان پێیانەوە پەیوەستن. سەرباری ئەمە لە دەوڵەتە هەرە پێشکەوتووەکانی سەردەمی تازەدا ئەگەر سیستەمە قانوونییەکان ئازمایشت بکەین، لە ڕوانگەی بنەما مێژووییەکانەوە، ئەوا پێویست دەبێ بیانگێڕینەوە ئەو سەردەمانەی کەوا دۆخی باوی ئەو کاتیان هاودۆخی رۆشنبیرییە سەرەتاییەکان یا بەراییەکان بووە. ئالێرەوە گەر بمانەوێ لە گرنگی قانوون بگەین وەك ئامرازێکی دیسپلینی کۆمەڵایەتی، ئەوا هیچ هۆشەنگییەك لەوەدا نییە ئەو شێوازەی کەوا پرەنسیپە پێودانگییەکان کاری پێدەکەن لە کۆمەڵگای جیاواز و هەمەڕەنگەکاندا فەرامۆش بکرێ. چونکە



پشکنینێکی ئەوا تەنها هەر ئەوەمان بۆ نارەخسێنێ کە بڕیار دەین ئایا لە تێکڕای کۆمەڵگە ناسراوەکاندا پێودانگێك هەیە بشێ پۆلکاری بکەین و بەهەقیش بەڕەوای بزانین، بەڵکو دەکرێ تیشك بخەینە سەر ریشە قووڵ و شاراوەکانی قانوون لە سیستەمە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکانیشدا لە ڕێگەی بەژێر زەڕەبین خستنی ئەو مەسەلانەی کە دەکرێ بە سانایییەکی زێتر ببینرێن لە شێوەیەکی سادەی شێوەکانی کۆمەڵگەدا.

## عورف و عادەت و لاساییکردنەوە

ئەو پێودانگانەی لە کۆمەڵگە کەمتر پێشکەوتووەکاندا پراکتیزە دەکرێن ناوی (قانوون عورفی) یان لێدەنرێ، لێرە بەدواوە جارێ ئەو وشەیە بەکارناهێنین و تەنها وشەی (عورف) یا (عادەت-خوو) بەکاردێنین، پێویستە لەلای هێروەشدا ئەم دەستەواژەیە (عورف) جیاکەینەوە لە دەستەواژەی (عادەت) و دەستەواژەی (تقلید-لاساییکردنەوە). تەواوی ئەو دیاردانە لە هەر کۆمەڵگایەکدا هەن و دەکرێ روونیانبکەینەوەو نموونەشیان بۆ بهێنینەوە لە کۆمەڵگاکانی خۆماندا.

خوو-عادەت- شێوازە رەفتارێکە بەرێکوپێکی دەیگرینەبەر، بێئەوەی بە زەرووڕەت نەگۆڕ بێ، بەبێ هیچ هەستێك بە پەیوەستبوون یا نەکو بە زۆرەملێ پابەندبین پێیەوە. نموونەی ئەمەش راهاتن لەوەی لە دەرەوەی ماڵدا کڵاوێك لەسەر بنێیت، یاخود هۆیەکی گواستنەوەی جگە لە یەکیدیکە بەکاربهێنێت بۆ هاتووچۆ، لەوانەشە ئەم خووە زۆر بە ڕەسەن ببێ، چونکە پێکهاتەی سایکۆلۆژی مرۆڤ ئارەزوو دەکا خوو بۆ خۆی بخولقێنێ. ئەگەر ئەو ئارەزووەش نەبوایە ژیان تا ئەو رادەیە خامۆش دەبوو کە مومکین نەبوو سیستەمی کۆمەڵایەتی هەبێ... کەسانێك هەن خووەکانیان رێکوپێکتر پێڕەو دەکەن، گوایە دانیشتوانی

(کۆنیگسبێرگ- KONIGSBERG) کاتژمێرەکانیان ئەو کاتە ڕێکدەخست کاتێ فەیلەسووفی ئەڵمانی (کانت) دوای نێوەڕۆیان پیاسەیەکی دەکرد. بەڵام خاڵی یەکلاکەرەوەی خوو بەگشتی ئەوەیە کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە مولزەم نییە. ڕەنگە رابێم بە سواری شەمەندەفەر لەجیاتی پاس بچمە سەر کار، لەخۆڕا بێ بیرکردنەوە وادەکەم لەگەڵ ئەوەشدا هەستناکەم کەوتبمە ژێرباری هیچ جۆرە ناچارکردنێکی کۆمەڵایەتی تاوەکو وابکەم، دەشتوانم هۆی گواستنەوە بگۆڕم بە هۆییەکی دیکەی گواستنەوە کە لەبار بێ بێئەوەی هەست بە سەرپێچیکردنی هیچ پێودانگێك بکەم. راستە هەندێ لە خووەکان زاڵن- زۆرەملێیانەن، هەروەکو زانایانی شیکردنەوەی دەروونی بەدەریانخستووە، بەڵام ئەمە تەنها ئاکارێکی سایکۆلۆژییە لە ئاکارەکانی نارسیزم، کە نابێ تێکەڵ بکرێ لەگەڵ هەستی پەیوەستبوون کە ئەو کاتە بەدیار دەکەوێ کە کەسێك دانپێدادەنێ کەوا ئەرکێکی سەپێنراو بەسەریدا ئەنجامدەدا بەهۆی هەبوونی پرەنسیپێکی قانوونیی، یا کۆمەڵایەتی یاخود رەوشتی.

ئەم رەگەزەی پەیوەستبوون لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە تایبەتە بە رەچاوکردنی خووەکان. با لەمبارەیەوە نموونەیەك لە کۆمەڵگای خۆماندا بهێنینەوە، لەوانەیە پیاوێك رابێ بە شێوەیەکی دیاریکراو و ئاشکرا جل و بەرگەکانی بپۆشێ و بە چەقۆ و چەنگاڵ خواردن بخوا... تاد. ئەم ڕێسایانە رەهانین هەروەها بەلای خەڵکی بایەخدەریشەوە مولزەم نین، رەنگە سکۆتلاندییێك دامەن (KLIT) بپۆشێ و ئافرەتیش پەنتۆڵ لەبەر بکەن، لەوانەیە کەسێکی (بوونگەرا) پۆشاکی سەیر و سەمەرە بپۆشێ و یا خواردنی بە شێوەیەکی شاز بخوا، ئەمەشیان بە ئەنقەست دەیکا لە کۆمەڵگایەکدا ناسراوە بەوەی ئەم جۆرە مەسەلانە رەچاو دەکاو دەسبەرداریشی نابێ. جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان عورف و عادەت لەو جۆرەی لەمەو پێش ئاماژەمان پێکرد لەوەدایە کەوا ئەوانەی ئەو عادەتانە پەسند دەکەن و



دەسبەرداری نابن خۆیان بە شێوەیێ بە پابەند دەزانن و رەچاوی دەکەن. مرۆڤێکی ئاسایی کە دەچێتە خواردنگەیەك هەست بەوە ناکا کە ئازادە بە دەستەکانی خواردنەکەی بخوا هەروەها ئازادیش نییە دەستدرێژی بکاتە سەر دراوسێکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناشێ ئەو هۆیە شیکاتەوە کەوایلێدەکا پابەندبێ بەمە، بەڵام رۆشەنە کە خۆی بە ملکەچی پێودانگێکی کۆمەڵایەتی مولزەم یاخود ڕێسایەك دەزانێ کە هەندێ عادەتی خواردن لە شوێنە گشتییەکاندا قەدەغە دەکات، هەروەها هەستدەکا کەوا پابەندە بە پێودانگێکی قانوونیی یاخود ڕێساییەك رێگەی لێدەگرێ هێزی جەستەیی بەکاربهێنێ.

لە نێوان ئەم بەکارهێنانە باوەو عادەتدا، بەو واتایەی رۆشەنمانکردەوە، هەندێ شتی دیاریکراو هەیە لە کۆمەڵگەدا بە مولزەم دانانرێن، بەڵکو وا چاوەڕوان دەکرێ وەك شێوازە رەفتارێك خەڵك دەسبەرداری نەبن، ئەگەرچی لەڕاستیدا واناکەن، بێئەوەی پابەند نەبوون پێیانەوە هیچ جۆرە ناڕەزاییەك یا تێکەڵاوییەکی لێبیبێتەوە. ئەم جۆرە بەکارهێنانە دەکرێ ناوی لێبنێین لاساییکردنەوە (تقليد) یاخود رێککەوتنە عادەت (العادة الاتفاقية) دەکرێ لەمبارەیەوە هەندێ نموونە بهێنینەوە وەکو: وەڵامدانەوەی ئەو نامانەی بۆمان دێن یاخود سڵاوکردن و سڵاودانەوە. بەڵام خاڵی لاوازیی ئەم جۆرە لاسایکردنەوانە لەوەدایە کە نوێنەرایەتی پاشماوەی خووەکانی سەردەمێکی پێشتر دەکەن هەروەکو ئەو خووانەی ئێستا بەخێرایی وندەبن.. بۆ نموونە کاتێ وەك ئەتەکێتێك لەبەرامبەر ئافرەتاندا لەناو پاسێکی گشتیدا شوێنی خۆتی بۆ چۆڵدەکەی، لێرەوە ئاکاری جیاکەرەوەی رەفتارێکی رێککەوتەیی لاساییکەرەوە ئەوەیە ئەگەرچی هەندێ کەیش هەستبکەن کە مولزەمن رەچاوی بکەن وەلێ وا دانانرێ کە پێویستە تێکڕای رەچاو بکرێ، لە توانای تاکدا هەیە رەچاوی نەکاو بە ئارەزووی خۆی چۆنی بیەوێ وا بکات.

لێره بەدواوە تێبینی دەکەین کاتێ دەبینین لاساییکردنەوەکان و خووەکان پێودانگێن بەو واتایە کە ڕێسا بۆ ڕەفتار دادەڕێژن تاکو کاریان پێبکرێ، خووەکان ئاماژە بە هیچ ڕێساییێك ناکەن و پشتی پێنابەستن بەڵام تەنها ڕێکخستنێکی ڕێچکەیین کە کردار و ڕاستی بەخۆوە دەگرن. خووەکان ئەگەر هەمووشیان نەبن ئەوا گەلێکیان تایبەتمەندی پێودانگیانە بەخۆوە ناگرن، بەڵام لەسەر ئاستی خۆرسکانەی کەسیدا دەمێننەوە، ڕەنگە تاکە کەسێك بتوانێ ڕێسا بۆ خۆی دابنێ هەروەکو ئەو بڕیارە بنپوچانەی هەمیشە لەسەرەتای ساڵی نوێدا بڕیاریان لەسەر دەدات. بەڵام ئەم ڕێسایانە گرنگییەکی کەمیان هەیە لە بواری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییدا، چونکە تەنها ئاکاری دەرەکی نەوەکو ناوەکی لە ڕەنگی خوودا دەنیشێ و ڕاستییەکەشی ئەوەیە دەشێ خووەکان ببنە عورف ئەگەرچی ڕوونکردنەوەی هۆیەکانی ئەم گۆڕانکارییە سەختە و ڕەنگە زۆر فاکتەریش لەمەدا بەشداربن، جا ئارەزووی لاساییکردنەوە لە نێوان بوونەوەرە مرۆییەکاندا لێرەدا ڕۆڵی خۆی هەیە، ئەم ڕۆڵەش زۆر جاران زێدەڕۆیی تێدا دەکرێ هەروەکو (تارد-TARDE)ی زنا لە کتێبەکەیدا (قانوونەکانی پێکچوون-قوانین المحاکاە) زێدەڕۆیی کردووە، گەلێ خەڵك متمانە دەکەنە سەر ئەوەی کە ئاخۆ مومارەسەی ئەندامێ یا کۆمەڵێ ئەندام کە دەسەڵاتێکی تایبەتیان هەیە لە کۆمەڵگەدا جێگیربووە تاوەکو چاوی لێبکرێ. ڕەنگە ئەم مومارەسەیە بە هۆی ڕۆشەنی یاخود سوودەکەی بەرەوی هەبێ. هەرچۆنێکی بێ کاتێ ئەم مومارەسەیە دەبێتە شێوەییێکی دانپێدانراوی شێوەکانی پێشکەوتنی مرۆیی بە حوکمی پێڕەوکردنی لە ماوەییێکی دیاریکراودا، ئەوا دەبێتە پێودانگێکی داهێنەر بەتایبەت ئەگەر ئەرکێکی کۆمەڵایەتی بەرچاوی تێدا هەبێ، یاخود سوودێکی کۆمەڵایەتی هەبێ. دەشێ بگوترێ ئەو شتەی جێبەجێکراوە لە دەرەنجامدا دەسەلمێ کە هەمان ئەو شتەیە کە پێویستە ببێ و لەوانەشە پێویست بێ لە کۆتاییدا ئەنجامدرێ. ڕەچاوکردنی عادەت هەمیشە بەم شێوەیە پێشنەکەوتووە، ئیدی ڕەنگە عادەت دەرەنجامی ئەو نوێکارییە توندوتۆڵانە بێ کەوا چینی دەسەڵاتدار



دەیانکاتە قانوون، یاخود دەرەنجامی ڕەفتاری ئەو کەسایەتییە، پایەدار و دەستەڕۆیەی نێو کۆمەڵگا بێ کەوا چاوی لێدەکرێ. ڕەنگە سەرداریێ یا سەرۆکێك لە کۆمەڵگەییەکی بەراییدا کێشەیەك بەشێوازێکی تایبەت چارەسەر بکا هەرچەندە ڕەنگە ئەو کۆمەڵگەیە هیچ جۆرە چەمکێکیشی نەبێ لە بارەی پێشینەی قانوونییەوە-سابقە قانونیە- بەڵام بە حوکمی دەسەڵاتی سەرۆك یا بە حوکمی ژیرایەتی داوەر لەوانەیە دوای ئەمە عادەتێك بێتە ئارا کە دەکرێ لە حاڵەتی وەکو خۆیدا ببێتە مولزەم.

## خوو لە کۆمەڵگەی بەراییدا

خوو لەسەر هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا کاردەکاو پێویستە وایدانەنێین کەوا شێواز و کارەکەی لەسەر ئاستە جیاجیاکاندا چوونیەکە، لەبەر ئەمە لە سەرەتاییترین شێوازی کۆمەڵگەی مرۆییەوە دەستپێدەکەین، چونکە زانستی ڕەگەزناسی تازە (علم الاجناس الحدیث) بەچڕی بایەخدەداتە ئەم شێوازە کۆمەڵگایانە، بە شێوەییێك کە پشکنینو لێتوێژینەوەکان بوونە مایەی هەڵێنجانی ئەو زانیارییانەی کەوا تیشك دەخەنە سەر ئەو خووانەی کاریان پێدەکراو پەیوەندیشیان بە قانوونوە دەخەنە بەر تیشك.

سەردەمانێك باوەڕ وابوو مەحاڵە بکرێ ڕێسا قانوونیی و ڕەوشتی و ئایینییەکان لە کۆمەڵگەی بەرایی یەکمدا لێکجیا بکرێنەوە، چونکە تێکڕای ڕێساکان بەهەمان تەون تەنرابوونەوە، ڕاستە سەرچاوەی دەسەڵاتی خوو بەگشتی دەدرایە پاڵ هێزە خواییەکان یان نیمچە خواییەکان یاخود هێزەکانی میتافیزیك، ئەو کات باوەڕ وابوو کە ئەو هێزانە ئەو پێشینانەی (اسلاف) کە هۆز لەوانەوە هاتۆتە ئارا، ڕێگە بە خۆمان دەدەین گوڵبژێرێك لە وتەکانی (دورکهایم)، کە بە یەکێ لە تۆژەرەوە لە پێشەوەکانی ئەم بوارەیە، بهێنینەوە لە بارەی ئەو دروشمانەی هۆزە تۆتەمییەکانی ئوسترالیا پێڕەویاندەکرد... تاکە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەڵێ: هۆی پەیڕەوکردنی ئەو عادەت

و ڕێورەسمانە چیبوو؟ ئەوەیە کە پێشینانمان بەو شێوەیە بۆ مانیان ڕێکخستووە!... نووسەرانی وەکو (فۆستێل دی کالانگ-FOUSTEL DE CALANGE) و (دورکهایم) گرنگی پەرستنی پێشینانیان لە دارشتنی دامەزراوە کۆمەلآیەتییەکان و ئەفراندنی هاوکاری کۆمەلآیەتیدا بینیەوە. ڕاستییەکەی ڕەچاوکردنی خوو ڕەنگە پابەند بیٚ بە باوەڕە ئایینییەکانی گرووپەکە، زۆربەی ئاکارە پەیوەستەکانیشی لەم باوەڕەوە سەرچاوە دەگریٚ تاڕادەیەك نووسەرانێکی وەك (سێر هێنری مێین- SIR HENRY MAINE) لەو بۆچوونانەدابوو کە ناکریٚ ئەحکامی ئایینی و ئەحکامی مەدەنی (عەلمانییەت) لە کۆمەلگایەکی بەراییدا لێکجیابکرێتەوە، ڕاستە لێکجیاکردنەوەیان هەمیشە کارێکی سەرکەوتوو نییە، بەلآم ئەو ڕێسایانەی حەرامکردنی ئایینی (TABOO) دەسەپێنن لە نێو کۆمەلگەدا بە جۆریٚ کەوا سەرپێچیکار لەلایەن هێزەکانی سەرووی سروشتەوە سزا دەدریٚ لەوانەیە جیاواز بن لەگەلٚ ئەو ڕێسایانەی کەوا باری ئابووری و کۆمەلآیەتی لە نێو کۆمەلگەدا ڕێکدەخەن و لەلایەن دەسەلآتێکی مەدەنیشەوە- وەکو هۆز یا تیرە یا سەرۆکی هۆزەکە یاخود ئەنجوومەنی هۆشەنگان (پیران) یا نزیکترین کەسی زیان پێگەیشتوو- دەسەپێنرێن.

دوو چەمکی هەلەی گرنگ هەبوون بەرە بەرە نەماوە، یەکەمیان ئەو چەمکە بوو کە دەیگووت عادەتی کۆمەلآیەتی دلڕەق و دۆگماو نەگۆڕ بووە لە کۆمەلگای بەراییدا و پیاوی بەرایی لە بارودۆخێکی نائومێدانەدا دەهاتە دونیا و ناچاربوو لەو دۆخەدا تێکڕای خووەکانی هۆزەکەی ڕەچاو بکا. بەم شێوەیەش گروپ، نەوەکو تاك، دەبووە یەکەی سیستەمی کۆمەلآیەتی.

(سێر جیمیس فرێیزر- SIR JAMES FRAZER) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (لکی زێڕین-The Golden Boygh) بۆمانی باسکردووە کەوا (ئەو ئازادییەی لە سایەی حوکمی ڕەهای ستەمکارانەو زولٚمی هاڕەڕدا هەیە، گەورەترە لەو ئازادییەی لە سایەی ئازادی ڕۆشەنی ژیانێکی هەمە جیانەدا هەیە کە چارەنووسی تاك بە هۆی



ڕێوڕەسمە بۆماوەییەکانەوە لە بێشکەوە تاکو گۆڕ کۆت و بەند دەکات). بێگومان ئەو تێڕوانینە کاردانەوەیەك بوو بەسەر بیرۆکەی ڕۆمانسییەت کەوا نووسەرانی لە پێشدا بەروەیان پێدەدا، باسی لە ژیانێکی ئاسوودە و بەختەوەر دەکرد لە کۆمەلگاکانی یەکەمدا کە مرۆڤ تێیاندا لەسەر سروشت دەژیاو قانوونی سروشتی خێرخواز حوکمی دەکرد. بەو ئەندازەیەی کە ئەم وێنەیە نووقمی خەیالٚ و وێناکردن بووە، بیرۆکەی دوای ئەوەش کە لە بارەی کۆمەلگای بەرایی یەکەمدا دەدواو کەسەکانی تێیدا لە ترسی هێزە غەیبییەکان پابەندی ملکەچی ڕەها ببوون بە هەمان ئەندازە نووقمی خەیالٚ و زیادەڕەویی ببوو. بەشێکی ئەم تەمە لە سایەی ئەو پشکنینانەی کەوا تۆژەرێکی وەکو (مالینۆفسکی-MALINOWSKI) ئەنجامیدا لاچوو، ئەو ڕوونیکردەوە کە گەلیٚ لەو ڕێسایانەی کۆمەلگای بەرایی زادەی بیروباوەڕی تاریك و ترسان لە هێزە غەیبییەکان نین، بەلٚکو دەرەنجامی ئالۆگۆڕکردنی پێداویستی بوون لە ڕێگەی پەیوەندییە کۆمەلآیەتی و ئابوورییەکاندا، هەروەکو لە کۆمەلگەی ئێستاشماندا بە هەمان شێوەیە. جا چۆن کۆمەلگاکەمان ڕێسای قانوونیی لە پێناو ڕێکخستنی ئالۆگۆڕکردنی خزمەتگوزارییەکان و کالآکان و دادەنیٚ، ڕێسا عورفییەکانیش لە کۆمەلگا بەراییەکاندا ڕێکخەری پێداویستییە ئابوورییەکان و هیدیکەش بوون. سەرباری ئەمەش ئەو ڕێسایانەی کەوا نەرم و توانای گۆڕانیان هەبووە، بەکردەوە درکیان بەو جیاوازییە فراوانانە کردووە کە لە نێوان هەردوو شێوازی ژیان و ئامادەکاری هونەری ڕێکخستنی پێویست بۆ هەردووکیان هەبووە، بە شێوەیەك کە لە سیستەمی قانوونیی ئێستامان دەچیٚ، لەگەلٚ ملکەچبوون بۆ گونجانی بەردەوام لەگەلٚ بارودۆخە نوێیەکاندا، جا ئەحکامە دێرینەکان ملکەچی ڕاڤەکردنەوە دەبوونەوەو، ئەحکامی نوێش لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەهێنرانە ئارا.

## سزاكان و عورفی بەرایی

ئەمەیان بەرەو دووەمین چەمكی هەڵەی گەورەمان دەبا كە لەلای نووسەرانی لە پێشدا باوی هەبووە سەبارەت بە عادەتی بەرایی. رای زاڵی ئەوان وابوو كە مرۆڤی بەرایی دیلی خووە ماوەییەكان بووەو، مێشوولە ئاسا كەوتۆتە تەونی جاڵجاڵۆكە و بە ئەندازەییێك لە هێزەكانی ئایین و سیحر ترساوە كە دەرفەتیان بە هیچ كەسێ نەداوە بیر لە سەرپێچی ئەو خووانە بكاتەوە. لێرەوە ئەوان گەیشتنە ئەو دەرەنجامە كە لەو باوەڕەدابوون سزا لە كۆمەڵگەیەكی ئاوادا هیچ پێویست نەبووە. چونكە عورف لە خودی خۆیدا دەسترۆ و مولزەم بووە، هەر پێشێلكارییەكیش لە عورفەكاندا جێبەجێكردنی سزاكەی دەكەوتە ئەستۆی ئەو هێزە غەیبییانەی كەوا مردن و وێرانیان دەكردە بەشی هەر كەسێ سوكایەتی بەو رێسا پەیوەستانەی هۆزەكە بكردایە جا چ تاك چ كۆمەڵ بوونایە. پشكنینەكانی دواتر كە لە چەندین وڵاتانی جیهاندا ئەنجامدران ئەوەیان دەگەیاند كەوا ئەم چەمكە دوورە لە واقیعی كۆمەڵگای بەراییدا، چونكە دەریانخست مرۆی بەرایی هێرشی كردۆتە سەر عورف و رێورەسمەكانی خۆیی و بێباكانەش زینای كردووە بەپێی گووتەی (سیگڵ-SEAGLE)، هیچ كۆمەڵگاییێكیش نەبووە شێوەیەك لە شێوەكانی سزای نەبووبێ تا بەسەر ئەوانەی پێشێلی قانوون دەكەن بیسەپێنێ. بیرۆكەی خودی (مالینۆفسكی) سەبارەت بە سزاكان گۆڕانی بەسەر داهات كە كاتێك لە كاتەكان تێڕوانینێكی تێر ئایدیالیستانەی هەبوو لەمەڕ هێزی (ئاڵوگۆڕی-التبادلیة)ی رێكخەر و باڵادەست لە ژیانی هۆزەكانی دوورگەكانی ترۆبریاندا (TROBRIAND ISLANDS) كە ئازمایشت و تۆژنەوەكانی لە نێوانیاندا ئەنجامدابوو. لە كۆتاییدا هاتە سەر ڕای ئەوانەی وایدەبینن كە رەفتاری مرۆی بەراییش، وەكو مرۆی شارستان، پابەندی سزای سەركوتكارە، ئەگەرچی هەستكردن



یاخود پێداویستی بە ئاڵوگۆڕكێ (RECIPROCITY) لە جێبەجێكردنی ئەركەكانیدا (مەبەست ئەركەكانی سزایە-و-) بە شێوەیەكی كارا رەچاو دەكرێ.

ئەو شێوەیەی كەوا سزاكان و كاریگەرییان بەخۆوەی دەگرن متمانە دەكاتە سەر رادەی پێشكەوتنی دامەزراوە هۆزییەكان، جا لە دۆخی كۆمەڵگایەكی دواكەوتووی وەكو دۆخی هۆزەكانی (ئۆربۆس-URUBUS) لە بەرازیلدا كە كۆمەڵگاكەیان هیچ شێوە رێكخستنێكی هۆزیی فەرمی تێدا نییە و هیچ سیستەمێكی قانوونیشی تێدا پراكتیك ناكرێ، ئەوا تاكە سزا كە دەسەپێنرێ، جگە لەوەی هێزە غەیبییەكان یاخود تۆڵە دەیسەپێنێ، ئابڕووبردنی تاوانبارە تاكو تۆبە بكات، لەوانەیە سادەترین جۆری رێگەگرتن ئەوكات ئەوە بووبێ كە پەیوەندی بە تۆڵە سەندنەوە هەبووە، چونكە هەندێ ئەحكامی بۆ دانرابوو تەنانەت لەلایەن هۆزە دواكەوتووەكانی وەكو ئەسكیمۆش بە گوێرەی ئەو ئەحكامانە رێگەیان دەدا توندوتیژی بەكاربهێنرێ لە پێناو رێگرتن لە تۆڵەسەندنەوەو، لەلایەن هۆزەكانی (ترۆبریاندر-TROBERIANDERS)یشدا، سزاییێكی بەرایی دەسەپێنرا كە بریتی بوو لە (سڕینەوە لە لیستدا-STOP-LIST)، ئیدی ئەو مرۆڤەی ئەركە ئابوورییەكانی بەجێناگەیەنێ، هەروەكو یەكێك ئەو بڕە پارەیەی كە عادەت وابوو دەبوایە بیدا، نەیدابا كۆمەكی ئابوورییانە نەدەكراو بەم شێوەیە بە تەنها و دوورە پەرێز و بێپشتیوان فەرامۆش دەكرا. سزا لە كاتی بارودۆخە مەترسییەكاندا دەسەپێندراو ئەگەر ژیانی گرووپیش بكەوتبایە مەترسی ئەوا سزاكە تاڕادەی دەركردن و مردن دەبوو، ئامانجی سزا بە تەنها سزادانی تاكە كەس نەبوو، بەڵكو پتر مەبەستی بوو بارودۆخەكە بگەڕێنێتەوە سەرباری پێشووی خۆی، واتە پاراستنی سیستەمی كۆمەڵایەتی، چونكە پێشێلكردنی وەك ئەوە وابوو هاوكاری كۆمەڵایەتی بشێوێنێ.

له چ رووێکەوە عورفی بەرایی جیاوازە لەگەڵ قانوونی پێشکەوتوو؟ بینیمان کەوا عورف لە کۆمەڵێ ڕێسا پێکدێ کە جیاوازن لە ڕێورەسمی ئایینی پەیڕەوکراوو، ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی هۆز بە شێوەیەك ڕێکدەخەن کە زۆر نزیکە لە ئەرکی قانوون لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتوودا. سەرباری ئەمە گەلێ لەو ڕێسایانە، ئەگەر هەمووشیان نەبن، خاوەن مۆرکێکی عەلمانی نەبوونەو دووچاری پێشێلکردنی و ڕەچاونەکردن دەبوونەوە هەروەکو چۆن قانوون تازەکانیش دووچاری هەمان کێشە دەبنەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ناکرێ پەنا بەرینە بەر ناچارکردن و پەیوەستبوون کە لە شێوەی ڕێساو ئەحکامدا ئەو دۆخانە ڕێکدەخەن کە لەوانەیە هێزیان تێدا بەکاربهێنرێت. بێئەوەی مەترسی هاندانی تۆڵەسەندنەوەیان تێدا بەدیبکرێت. ئەو پێشێلکارییە مەترسیدارانەی هەڕەشە لە ئاسایشی هۆز دەکەن پاساو بۆ سەپاندنی سزای مردن دەهێننەوە جا ڕاستەوخۆ بێ یاخود لە ڕێگەی بڕینی تێکڕای جۆرەکانی کۆمەکی ئابووری بێ کە داکۆکی لە بکەر دەکەن، کاتێکیش مەسەلەکە پەیوەندی بە تۆتەمی ئایینییەوە دەبێ، ئەوا کارەکە بەهێزە غەیبییەکان دەسپێردرێ تاکو ئەو سزایەی بە گونجاوی دەزانن بیسەپێنن. گەلێ شێوازی کۆمەڵگای هۆزایەتی هەن، هەندێکیان لەوانی دیکەیان پێشکەوتووترن و، هەندێکیشیان وەکو هۆزەکانی (بارۆتس-BAROTSE) دەزگایەکی دادگەری پێشکەوتووتریان هەیە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی کە چارەسەرکردنیان پێویست بە هەبوونی دادبینی دەکا لەبەرامبەر دادگاکاندا. هەرچۆنی بێ ئەوا ناکۆکی بنەڕەتی لە نێوان عورفی بەرایی و قانوونی پێشکەوتوودا لەوەدا نییە کە یەکەمیان ئاکارە ماددییەکانی قانوونی پێوە دیار نییە، یاخود جێگیرنەکراوە بە هۆی سزاکانەوە، بەڵکو لە نەبوونی حکوومەتێکی سانتراڵدایە.



## نەبوونی دەزگاییێکی قانوونیی لە کۆمەڵگەی بەراییدا

لەدەستدانی ناوەندێتی، بەپێی گوزارەی تازە، دەگاتە ئەو ئاستە کە بڵێین ئەو کات (کۆمەڵ-COMMUNITY)، هەبووە نەوەکو دەوڵەت STATE، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەزگای ناوەندی نەبووە قانوونەکان دابڕێژێ و جێبەجێیان بکا. ئەمەش واتای ئەوە نییە کە لەوێدا جگە لە عادەت و عورفی نەگۆڕی هەتا هەتایی هیچی تر نەبووەو هەر بۆ خۆشیان باڵا دەست بوون. گومان لەوەدا نییە کە هەرچەندە شێوازی ژیان سادەبووبێ و کۆمەڵەکە ئارامتر بووبێ ئەو هێندەش هەستی گۆڕین و ئەفراندنی ئەحکامی نوێ یاخود ڕاستاندنی ئەحکامە دێرینەکان کەمتر بووە. قانوونی بەرایی نەرمییەکی ئەوتۆی هەبووە کە لەڕووی توانای خۆگونجاندنەوە لەگەڵ دۆخە نوێیەکاندا هاوشێوەی قانوونی پێشکەوتووەو، نەبوونی دەزگاییێکی ڕێکخەر کە بە فەرمی ئەرکی قانووندانان و جێگیرکردنی بگرێتە ئەستۆ وا دەکات گۆڕان لە ڕێگەی دیکەوە ئەنجامبدرێ. بۆ نموونە ڕەنگە ئەنجوومەنی هۆشەنگان (یاخود پیران) ڕاڤەکردنێکی نوێ ببەخشێتە ڕێساییێکی دێرین یا ڕێساییێکی سەراپا نوێ داڕێژێ. دەشێ دەرەنجامی یەکلاکردنەوەی کێشەییێك حوکمی بدرێ و ببێتە پێشینەییێکی دادوەری (سابقة قضائية) بۆ ئەو کێشانەی لە ئاییندەدا دێنە پێش (هەروەکو لە دادگەری هاوچەرخدا ڕوودەدات). لە هەردوو حاڵەتدا عورفی نوێ یا ڕەڤەکردنی نوێ دەسەڵاتی لە دەستەییێکی قانووندانانەوە یاخود لە دەسەڵاتێکی دەستوورییەوە کە کەسێ یا دەستەیێ سەرپەرشتی دەکا بەدەسناهێنێ، بەڵام لە ڕێگەی ئەو شکۆیەوە کەوا پیران یا سەرکردەکان هەیانە دانیپێدادەنرێ، یاخود بەهۆی مشووری ڕۆحی پێشینیان یا هێزێکی دیکەی غەیبی یا لەبەر ئەوەی حوکمەکە بەلای کۆمەڵەوە دادوەرانەو ژیرانەیە دانیپێدادەنرێ... پێویستە لە زەینماندا هۆشیاری ئەوە بین کە لەو کۆمەڵگایەی هیچ تۆمارێکی نووسراوو، هیچ جۆرە لە جۆرەکانی نووسەری تێدا نییە، ئەوا عورفی کارپێکراوی

هۆزەکە لە وردەکاری و راستگۆیی و باوەڕپێکردنیدا پشت دەبەستێ بە یادەگەی (ذاكرة) سەرۆك و حەکیم و پیرەکانی. پاڵپشت بەمەش، ئەگەر هەڵەکردنی یادگەی مرۆڤیش بووەتە هۆی لێهەڵوەشان و زۆربوونی بابەتی قانوونی عورفی.

نەبوونی دادگای دادگەری بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان، ئەگەرچی ئەم دادگایانە بەدەگمەنیش هەبووبن لە هەندێ حاڵەتداو، لەدەستدانی دەزگای ناوەندی بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکان ئەوە دەگەیەنێ کە قانوونی بەرایی متمانە دەکاتە سەر شێوازی دیکەی جێبەجێکردن لەوانەش وەرگرتنەوەی خودی مافەکەیە کە خزمێکی کەسی زیانپێگەیوو پێیهەڵدەستێ. ئەم جۆرە کارانە پێدەچێ لە کۆمەڵگاییێکی بەرتەسك و بچووکدا کاریگەر بن. کاتێ باسی ڕاوبۆچوونەکانی زانایە تازەکانی کۆمەڵناسیمان کرد ئاماژەمان بە گریمانەکەی (رۆسکۆ پاوەند- ROSCOE POUND) کرد کە دەڵێ: هەر کۆمەڵگاییێکی مرۆیی ئایدۆلۆژیاییێکی قانوونیی تایبەت بە خۆی هەیە کە بەدیهیاتە سەرەتاییە سەرەکییەکان پێکدێنێت و لە سیستەمە قانوونییەکەشیدا (هۆبل-HOEBEL) ئەم شێوازە هزرەی بەسەر شێوازە جیاجیاکانی کۆمەڵگا بەراییەکان، کە لە قۆناغی جیاجیای پێشکەوتندا بوون پراکتیزە کردو، توانی لەڕووی پرەنسیپەوە بەدیهیاتی هەر سیستەمێکی قانوونیی لە هەر کۆمەڵگاییێ بەجیا هەڵێنجێ و، پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا دەستنیشانبکاو، پراکتیزەکردنیشیان بەپێی رێسا عورفییە پێڕەوکراوەکانی کۆمەڵگاکە رەچاو بگرێ.

دەکرێ ئاماژە بە یەك دوو نموونە لەو نموونە زۆرانەی دیراسەکانی (هۆبڵ) بکەین، هەروەکو دیارە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەسکیمۆ سادەیەو دامەزراوە قانوونییەکانیش بەرایین بەجۆرێ دەشێ بڵێین پرەنسیپی بنچینەیی لە رۆشنبیرییاندا کەمن کە بشێن وەکو بەدیهیاتی قانوونیی لەبەرچاو بگیرێن. یەکێ لەو پرەنسیپانەی (هۆبڵ) باسی کردوون ئەوەیە کە دەڵێ: (ژیان سەختەو ماوەی ساغلەمیش کورتە و ناکرێ



ئەندامە بێبەرهەمەکانی کۆمەڵگە بەخێو بکرێن). هەروەها (تەواوی سەرچاوە سروشتییەکان بەربڵاون و بۆ هەمووانن و پێویستە تێکڕای کەرەستەکانی بەرهەمهێنان وەکو کەرەستەکانی راو لە حاڵەتێکی باشدا پارێزگاریان لێبکرێ و بە شێوەییێکی کارا درێژترین ماوەی مومکین بۆ بەکارهێنان بشێن). ئیدی لەوەیدا کە پەیوەندی بە پرەنسیپی یەکەمەوە هەیە روونەبێتەوە کەوا پاساوێکی شەرعی فەراهەمدەکا بۆ هەندێ رەفتاری وەکو زیندەبەچاڵکردنی منداڵ و (یا کوشتنیان) کوشتنی نەخۆشەکان و بەساڵاچووەکان و شێوەکانی دیکەی کوشتن کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەسەند دەکرێن. بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە پرەنسیپی دووەمەوە هەیە ئەوەیە کە کۆمەڵێ دەرەنجامی گرنگی لێکەوتەوە، لەوانەش زەوی کە لەلای ئەسکیمۆکان بە هیچ شێوەییێك لە شێوەکان بە سامانێکی موڵککراو ئەژمار ناکرێ، بەجۆری مرۆ دەتوانێ لە هەر شوێنێ بیەوێ راو بکا، چونکە سنووردارکردنی هەوڵی گەڕان بەدوای خۆراك بەلای ئەوانەوە کارێکی ناپەسەندەو، جگە لەمە ئەو ئاژەڵانەی راو دەکران و تەواوی ئامرازەکانی بەکارهێنانی کەسی شتێ بوون دەشیا بکرێنە موڵك، هەر چەندە ئەسکیمۆ دژی ئەوەن کە مرۆ شتی زۆر بۆ خۆی بکاتە موڵك و، لە دەرەنجامیشدا دژی سنووردارکردنی ئەم ماڵانەبوون کە دەکرا کۆمەڵ بە شێوەییێکی کارا سوودیان لێوەربگرێ. بۆ نموونە لە یەکێ لە ناوچەکانی ئالاسکا ئەگەر مرۆ بڕێکی زۆر کاڵای هەبووایە زێتر لەوەی کە مرۆڤێك بۆ ماوەییێکی درێژ سوودی لێوەردەگرێ بە تاوانێکی گەورە ئەژمار دەکراو، دەستیان بەسەر ئەو کاڵایانە دادەگرت لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەڵ. با نموونەییێکی تر بخەینە بەردەست، لەلای هۆزەکانی (ئیفوگاو-IFUGAU) لە باکووری (لۆزۆن-LUZON)، کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە ئەسکیمۆکان رێکخراوترن پرەنسیپێکی بنەڕەتی هەیە کە دەڵێ (خزمایەتی دوو سەرە یەکەییێکی شەرعی و کۆمەڵایەتی بنچینەییە و بە مردووەکان و زیندووەکان و ئەوانەی هێشتا لەدایك

نەبوون پێکدێ) و (بەرپرسیارەتی تاکەکەسی لەبەرامبەر خزمەکانیدا لە پێشترە لە بەرژەوەندییەکانی خۆی)، ئەم پرەنسیپە دەرەنجامی قانوونیی گرنگی لێکەوتەوە. بۆ نموونە گەلێ لە شێوەکانی موڵکییەت وەکو (سپاردە) مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا نەوەکە وەکو موڵکییەتێکی رەها: واتە پاراستنی (سپاردە) بۆ نەوەکانی داهاتوو. جا لەبەر ئەوەی خێزان بە تەنها لە زیندووەکان پێکنەدەهات، بەڵکو مردووەکان و ئەوانەی کە هێشتا لە دایکیش نەبوون بەشێکی خێزان بوون... بایەخدانە مردووەکان لە پێش بایەخدانە زیندووەکان و ئەوانەی لە ئایندەدا لەدایك دەبن دەهات، بۆیە دەکرا کێڵگەکانی خێزان لە کاتی پێویستدا بفرۆشرێن بەمەبەستی کڕینی هەندێ ئاژەڵ بۆ قوربانی تاکو هاوەڵی رۆحی پێشینانی کۆچکردووبێ، هەروەها دەشیا بە مەبەستی چارەسەرکردنی یەکێ لە ئەندامانی خێزان بفرۆشرێن گەر نەخۆشییەکی ترسناکی هەبووایە، ئاسانیش نییە بەدرێژی لە بارەی ئەم مەسەلانەو مەسەلەی هاوچەشن بدوێین لە چوارچێوەی ئەم کتێبەدا. بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەوا (هۆبڵ) بەڵگەی زۆری هێنایەوە سەبارەت بەوەی کە پرەنسیپەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی کەوا بایەخی پێدەدەن، پەیوەندن بە ئەحکامە قانوونییەکان کۆمەڵگاکە و دامەزراوەکانی و، بەو شێوەیەش کە وایدەکرد هەمان ئەو پرەنسیپانە رەنگی ژینگەی ماددی و بارودۆخی رۆشنبیری نێو ئەو کۆمەڵگایانەی لێبنیشێت کە بابەتی باسەکە بوون.

دوو فاکتەر لە شیکردنەوەکەی (هۆبل)دا سەرهەڵدەدەن: یەکەمیان- ئەو شێوازەیە کە بەهۆیەوە هەر کۆمەڵگەیێك دەبێتە خودان پرەنسیپی قانوونیی ئاراستەکراو بە مەبەستی پاراستنی سیستەمێکی جێگیر کە لەگەڵ پرەنسیپە بنەڕەتییەکاندا دەگونجێ. دووەمیان- سەرکەوتنی کۆمەڵگایە لە پاراستنی ئەو جێگیرییە کە متمانە دەکاتە سەر ئەو پلە پێگەیشتنەی سەرکەوتووانە بەدیهێناوە، ئەمەش بەش بەحاڵی خۆی کار دەکاتە سەر ئەو پلەیەی کەوا ئایدیۆلۆژییای بنچینەیی لە



رەزامەندی گشتیدا بەدەستی دەهێنێ. (هۆبل) ئەوەشی روونکردەوە کەوا کۆمەڵگەییێکی نایەکگرتووی وەکو هۆزە هیندییەکانی ئەمریکا دووچاری پەشۆکاوی دەبن کاتێ قانوونی عورفی جێبەجێدەکرێ.

## بەراووردکاری نێوان قانوونی بەرایی و قانوونی نێودەوڵەتی

لەوەی کە لەپێشدا باسمانکرد روونخدەبێتەوە کەوا عورفە بەراییەکان گەلێ تایبەتمەندی قانوون ئاسایان هەیە لە کاتێکدا زۆربەیان دەزگاکانی بنەڕەتی ناوەندێتی و حکوومەتییان نییە، واتە خودان ئەو قانووندانەرە نین کە قانوونی نوێ بە شێوازێکی ئاسایی دادەڕێژێ و، ئەو دادگایەشیان نییە کە تایبەتمەندییەکانی پەیوەستبن لە یەکلاکردنەوەی کێشەکان و هاوکات خودان ئەو دەسەڵاتەی جێبەجێکردنیش نین کە سەرپێچی نەکردنی قانوونەکان دەستەبەر دەکا، بەم شێوەیەش ئەو هۆیە روونخدەبێتەوە کە گەلێ لە نووسەرە تازەکانی وەکو (کیلسن-KELSEN)ی هاندا بگەنە ئەو باوەڕە کە قانوونی نێودەوڵەتی هاوچەشنی قانوونی بەراییە لەو لایەنەوە کە سیستەمێکی پێودانگی مولزەمە و لە کارپێکردنیدا متمانە دەکاتە سەر خود، بەڵام خودان دەزگای ناوەندی نییە کە ئاکارێکە لە ئاکارەکانی قانوونی پێشکەوتوو. ئامانجی سەرەکی لە بەراووردێکی ئاوادا تەنها هەر ئەوە نییە کە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە قانوونی نێودەوڵەتی شایانی ئەوەیە وەکو قانوون پۆلکاری بکرێ نەوەکە وەکو (رەوشتی دانراو) هەروەکو ئۆستن پێیوابوو، بەڵکو ئامانج رۆشەنکردنەوەی رێگایە بەرەو پێشکەوتنەکان، بەڵام هەروەکو چۆن قانوونی تازەو هەرە پێشکەوتوومان کە لە خودی خۆیدا دەسترۆیەو بەرەبەرە گەیشتۆتە ئەم قۆناغەی پێشکەوتن و لە دۆخی کۆمەڵایەتی بەراییدا بەرو پێشچووە لە کاتێکدا دەزگای ناوەندی پێویست بۆ

جێبەجێکردنی کەمبووە یاخود هەر نەبووەو، تێیدا خزمەکان مسۆگەرکردنی قەرەبووکردنەوەی قوربانیبوونیان دەگرتە ئەستۆ، هەر ئاوەهاش پێشبینی دەکرێ قانوونی نێودەوڵەتی بەرەبەرە لە حاڵەتی بەراییدا بەرەو قۆناغێك بڕوا کە دەزگاکانی قانووندانان و دادوەری و جێبەجێکردنی نێودەوڵەتی تێدا هەبێ، بەمەش قانوونی نێودەوڵەتی دەگاتە دۆخێکی هاوشێوەی قانوونی نیشتمانی کە هێشتا زۆری ماوە بیگاتێ.

ئەگەرچی ئەمە تەنها پێشبینیکردنێکی هاندەرە، وەلێ باشتر وایە زێدەڕەوی لە چوونیەکبوون و پێکچوواندندا نەکرێ، چونکە هێشتا گەلێ جیاوازی گرنگ هەن لە نێوان قانوونی نێودەوڵەتی ئێستا و قانوون لە کۆمەڵگەی بەراییدا کە ناکرێ خۆمانی لێبدزینەوە. قانوونی نێودەوڵەتی قانوونێکە لە نێوان دەوڵەتاندا و رەفتاری دەوڵەتە نەتەوەییەکان حوکمدەکا نەوەکو هی کەسان، زۆربەی ئەو دەوڵەتانەش بریتین لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوو و ئامادەکراو بە تەکنەلۆژیا، هەروەکو لە پێشتریشدا روونمان کردبووەوە ئەوا مەسەلەی جێبەجێکردن (مەبەست جێبەجێکردنی قانوونی نێودەوڵەتییە-و-) وێنەیێکی زۆر جیاواز دەنوێنێ، چونکە ئەوانەی ناچار دەکرێن جێبەجێکردنەکەی پەسەند بکەن میللەتانن نەوەکو کەسان (هەرچەندە دەوڵەمەند و بەهێزیش بن)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە رێگای بەرەو پێشخستن و کامڵبوونی قانوونی نێو دەوڵەتی رێگەیێکی جیاواز دەبێ لەوەی قانوونی نیشتمانی گرتبوویەبەر. گەلێ وانەی بەنرخ هەن کە لە شێوازی پێشکەوتنی قانوونی تازە فێریانبین کە لە بواری نێودەوڵەتیشدا سوود بەخشدەبن بۆ دەزگاکانی قانووندانان و دادگەریی و جێبەجێکردن. بەم شێوەیەش دەرفەت نییە لە بارەی چوونیەکبوون و پێکچوون بدوێین. چونکە جێبەجێکردنی راستەقینەی سەرکەوتوو پێویستی بە بنیاتنانێکی بەرەبەرەیی و ئازمایشتکارانەی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان هەیە، پشت بەو شارەزاییە ببەستێ کە دەرەنجامی کارکردنەو،



دەرنجامی چاوپێخشاندنەوە بێ بەو شێوازانەی کەوا قانوون دەکەنە ئومێدگەی مرۆڤایەتی لەم سەردەمەماندا و لەو بارودۆخانەی کەوا خۆمانی تێدا دەبینینەوە، لەوانەش دۆخی سەرنەکەوتن لە پاراستنی ئاشتی کە رەنگە خێرایی و وێرانبوونی سەرپاکی رەگەزی مرۆیی و لەناوچوونی لێبکەوێتەوە.

## قانوونی عورفی لە کۆمەڵگەی فیودالیزم و چاخە دێرینەکاندا

گەلێ قۆناغی ناوەڕاست هەنە لە نێوان سەرجەم قانوون عورفییەکانی کۆمەڵگە بەراییەکان و زانستی پێشکەوتووی رۆشنگەر لە دەوڵەتی تازەدا، لەڕابردوودا دەوڵەت و ئیمپراتۆریەتی شارستان یا نیمچە شارستان سەریانهەڵدا، کە تاڕادەیەك قانوونەکانیان نووسرابوونەوەو تۆمارکرابوون، هەروەکو لە ئیمپراتیۆریەتی (بابل)دا، یاخود لە دوازدە تابلۆکانی کۆماری رۆمانیدا یا لەو قانوون لاهوتییەی کەوا (دیترۆنۆمی Deuteronomy) داینا، پێشکەوتن گەیشتە ئاستێك کە دەسەڵاتی قانووندانان بێتە ئاراو مۆرکێکی نادیرکراوی هەبێ و دەسەڵات ببەخشێتە لایەنێك لەو کۆمەڵگایەدا، هەروەکو پاشا کە بە پیرۆز یا نیمچە پیرۆز لە قەڵەم دەدرا، یا کۆمەڵەیێك کە لە هاووڵاتییان پێکهاتبێ یا هەر گروپێك یاخود چینێکی خودان دەسەڵاتێکی وەکو ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان لە رۆمادا، لەگەڵ ئەوەشدا بنەماکانی قانوون هەر بە عورفی مانەوەو، قانووندانانیش بەکارێکی ئیستسنایی دادەنراو پەیوەندبوو بە راڤەکردنی خودایی راستەوخۆ، هەروەکو لە شەریعەتی موسادا، یاخود پەیوەندبوو بە ئیلهامی خوایی یانەکو رەزامەندی خواوەندەکان و پەسەندکردنیان.

مەبەست لە قانووندانانێکی ئاوەها دروستبوونی کۆمەڵێ قانوونی نوێ نەبووە کە ئامانجی تۆمارکردن و روونکردنەوەی ئەو قانوون عورفییە بێ کە پێشتر هەبووە،

ئیدی کێشمەکێشمی چینایەتی و ئارەزووی چینی دەسەڵاتدار یان توێژی ئایینی ئەوەبوو کە قانوونی عورفی قانوونییێکی نارۆشەن بێ، جا چ دەستنووس بێ یا دەستنەنووس ئەوا ناشێ چاوی پیس بیبینێ، ئەمە بووە هۆی چەندین راپەڕین و یاخیبوون کە دەرەنجامەکەی هەندێ جاران بڵاوبوونەوەی قانوونی عورفی بووە هەروەکو دۆخی دوازدە تابلۆکانی رۆمانی. هەڵبەتە ئەم قانوونیە تۆمارکراو و رێکخراو نەبووە بەواتای تازە، بەڵکو شتی پەرتوبڵاوی تێدابووە کە پێویست بوو لەسەر خەڵك بیزانن، یاخود مەبەستی روونکردنەوەی عورفە دێرینەکان بووە، بەڵام ئەم جۆرە تۆمارکراوانە هەر بە تەنها دووبارە بە قانوونکردنەوەی عورفە دێرینەکان نەبوون، بەڵکە هەندێ نوێکاریشیان تێدا هەبووە، سەرباری ئەمە هەر تەنانەت دارِشتنەوەی قانوون، هەتاکو ئەگەر قانوونکە پووچ بێ لەبەر کۆنیەکەی و کەس کاری پێنەکا بۆ خۆی وەکو خاڵێکی دەسپێکردنە بۆ پێشکەوتنی نوێ، چونکە سەرهەڵدانی هەر دۆخێکی تازە پێویستی بە راڤەکردنێکی قانوونیی هەیە. لە رۆمانی دێریندا پیاوانی ئایین و پاپەکان خودان دەسەڵاتی راڤەکردن بوون، ئەگەرچی تەنانەت دارِشتنی قانوون لە خۆیدا بەو واتایە بوو کە ناکرێ دەسکاری بکرێ، هەروەکو قانوونەکانی میدییەکان و فارسەکان، لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگە لە جیهانی دێریندا، ئەگەری قانووندانان تا ئەو رادەیە سەقامگیربوو کە هەندێ جاران دەگەیشتە دووبارە دارِشتنەوەی قانوونەکان، ئیدی ئەوەبوو لە سەدەی پێنجەمدا دەستەی هاوولاتییان لە ئەسینادا لە توانایدا هەبوو قانوون بگۆڕێ، ئەگەرچی دەوڵەتە یۆنانییە هزر تەقلیدییەکان، بەتایبەتیش ئیسپارتە، قانوونەکانی خۆیان بە نەگۆڕ ئەژمار دەکرد، سەرەڕای ئەمە قانوون لە تەواوی ئەو قۆناغانەدا هەر بە عورفی و نەنووسراوی مایەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە گەلێ عورف لە بیرکران یا پووچەڵبوونەوە دەرەنجامی بەکارنەهێنانیان یاخود خۆیان گونجاندووە تاوەکو



هاوڕەوتی بارودۆخە کۆمەڵایەتییە گۆڕاوەکە بن یاخود دامەزراوەو قانوونی عورفی نوێ جێگەی ئەوانیان گرتۆتەوە.

## قانوونی عورفی لە "چین"دا

پێدەچێ هەندێ کۆمەڵگەی شارستان و پێشکەوتوو هەرگیز بیرۆکەی قانوونی جێگیر و رەقیان قبوڵ نەبووبێ جا چ تۆمارکراو چ عورفی بووبن، گەرچی ناکرێ سەبارەت بە حوکمکردنی دۆخە باوەکانی ئەو کۆمەڵگایانە دەسبەرداربیان بین، سیستەمی قانووندانانی ئیمپراتۆریەتی "چین" روونترین قانوونیە لەم بوارەدا، چینییەکان نەگەیشتبوونە ئەو باوەڕە کە قانوونی ماددی جێگیر فەرمانڕەوایی گەردوون بکا، بەڵکە گەردوونیان بەحۆرێ لە گونجان لە نێوان هێزی ململانێکاری جیاواز دادەنا بە شێوەیەك کە (بەخشندەی قانوون) لەوێدا نییە تا سیستەمێك بۆ کەون دابنێ، کەواتە ناشێ قانووندانەرێ هەبێ بتوانێ قانوونی دانراوی نەگۆڕ یاخود رێسای رەوشتی بۆ مرۆڤایەتی دابڕێژێ، گومان لەوەدا نییە پێودانگە عورفییەکان لە "چین"یشدا، هەروەکو لە وڵاتانی دیکەدا، هەبوون و لە هەندێ ئاکاریاندا بەهێزترین دەسەڵات بوون هەروەکو لە رێزلێنانی دایك و باوك و یارمەتیدانی کەسانی دیکەی خێزان، کەچی لەبواری کێشمەکێشمە قانوونییەکاندا چینییەکان نەگەیشتنە ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ ئەو کێشمەکێشمە قانوونییانە دەکرێ لە رێگەی پراکتیزەکردنی پێودانگی پێشتر دارِێژراو چارەسەر بکرێن بە هۆی دەزگایەکی دادوەری دەسبەکار، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێیان وابوو دادی قانوونیی لە ئاکامی هەوڵدان بۆ ئەفراندنی گونجان لە نێوان بەرژەوەندی لایەنەکان بەپێی گیانی گونجانی گەردوونی پێکدێ کە لە رێگەی مشوور و پراکتیزەکردنی رایەکانەوە بایخۆی بەخشیوەتە ئاوەزی مرۆڤ.

کۆمەڵگایەکی وەکو ئەمە دەبێ گەیشتبێتە پلەیەکی گەلێ پێشکەوتووی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە چەقدەبەستێتە سەر بونیادێکی قانوونیی و پێودانگی کۆمەڵایەتی ریشە داکوتای ئەوتۆ کە ئاستێکی بەرزی نەرمی و گوماناوی لەسەر پاکی بوارەکانی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە بەخۆوە دەگرێ و سنووری ئەو بوونیادە بنەڕەتییە نابەزێنێ.

رەنگە بە هۆی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمی خێڵەکی لە دیرۆکی چیندا، هەروەها بۆ سەرنەکەوتنی هیچ جۆرە سیستەمێکی بازرگانی یا پیشەسازی رێکخراو بەوەی کە خۆی داکوتێ لەوێدا، ئەگەرچی شارستانیەتی چین لە ئاستێکی بەرزی پێشکەوتندا بووەو ئەم گەلەش دەسکەوتی تەکنەلۆژیای بەرچاوی بەدیهێناوە.

## ئەوروپا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا

کاتێ دەڕوانینە دۆخی قانووندانان لە ئەوروپای چاخەکانی ناوەڕاستدا تێکەڵەیێك لە بارودۆخی قانوونیی ململانێکار دەبینین، جا لەلایەکدا دەبینین ئەو شانشینە نیمچە بەربەرییانەی لەسەر پاشماوەکانی ئیمپڕاتۆریەتی رۆمانی دامەزرابوون، کۆمەڵێ قانوونی عورفی فەرمانڕەوایی دەکردن کە بەرەبەرە بەشێکیان تۆمارکران و بەشی هەرە زۆریشیان عەلمانی بوون و متمانەیان نەدەکردە سەر ئەسڵی خودایی یا ئیلهامی خواوەندانە، پێشکەوتنی هێواشی سیستەمی فیودالّی سەبارەت بە دەربازبوون لە ئاژاوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە چاخە تاریکەکاندا ببووە هۆی هەرەسهێنانی حکوومەتی سانتڕاڵ، باری قانوونیی مرۆڤ وابەستبوو بە خاوەندارێتی زەوی و پەیوەندی مرۆ بەو دەرەبەگەی کە زەوی لێوەرگرتبوو، خەڵکیش یا جووتیارە کۆیلەی (قن) موڵکی دەرەبەگ بوون یاخود کۆیلەبوون و هیچ مافێکی



قانوونییان بەسەر ئەو زەوییەوە نەبوو کە دەیانکێڵا، بەڵکە هەمیشە پابەندبوون بە زەویەکە و خزمەتکردنی خاوەنەکەی، لە بارودۆخێکی ئاوەهادا قانوون دابەشببووە سەر کۆمەڵێکی گەورەی عورفە خۆجێیەکان و هەر خودانێك لە دادگە تایبەتەکەی ناوچەکەیدا پراکتیزەی دەکرد.

ئەو دەسەڵاتە "پاشا"یش هەیبوو تەنها دەسەڵاتێکی بەناو و زۆر لاواز و قابیلی جێبەجێکردن نەبوو، لە هەمان کاتدا، هەندێ هێزی دیاریکراو لەوێدا بە هێواشی کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە ئاکار و سیمای پاشاگەردانی ئەوروپا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا سەرەوژوورکەن، لە پێشەوەی ئەو هێزانەشدا دامەزراوی کلێسای کاتۆلیکی هەرە مەزن بوو کە "پاپ" سەرپەرشتی دەرکرد و کۆنتڕۆڵ و دەسەڵاتی بەسەر تەواوی شانشینە فەلەکانی ئەوروپای خۆرئاوادا هەبوو، هەروەها قانوونی کلێسای پاپ کە سەر بە قانوونی رۆمانی دێرینەو، قانوونیەکی تۆمارکراوی خودان دەسەڵاتێکی قانووندانانی سەرچاوە گرتوو بوو لە خودی کەسی پاپەوە، هەرچەندە بەشێکیشی لە بنەما و شێوازدا عورفی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێکهەڵکێشی قانوون بوو یاخود لەگەڵ رێوڕەسمەکانی پاپدا یەکی گرتبوو، هەر کەسێکیش باوەڕی وابوو کە هیچ دەقێکی قانوونکە ناشێ گۆڕانکاری تێدا بکرێ تەنها بە ویستی خودی پاپ نەبێ بەو پێیە کە جێگری خودایە لەسەر زەویدا، سەرباری ئەمە هەتاکو لە شانشینە عەلمانییەکانیشدا، دەسەڵاتی قانووندانانی بێ سنوور درابوو بەو پادشایەی کە ئەنجوومەنی پیاوماقووڵانی شانشینەکە هاوکاریان دەکرد، پادشاش دەسەڵاتێکی دادگەری رەهای هەبوو سەبارەت بە یەکلاکردنەوەی کێمەکێشمە قانوونییەکان و دەرەنجام جاڕدانی عورفەکان شانشینەکە بە شێوەیەکی فەرمی، پێویست بەوە ناکات بڵێین کە ئەو جۆرە بڕیارانە هەندێ جاران نوێکاری بەخۆوە دەگرن و بەمەش بەشدارن لەوەی وا بکەن حوکمە عورفییەکان جووت بن لەگەڵ پێداویستییە کۆمەڵایەتییە نوێکان، هەروەها سەرهەڵدانی ئەو شارانەی کەوا

چینی بازرگان فەرمانڕەوایی دەکردن لە کۆتاییەکانی چاخەکانی ناوەڕاستدا، بە تایبەتیش لە باکووری ئیتالیادا، پێویستی بەوە کرد قانونیەکی بازرگانی پێشکەوتووتر بێتە کایەوە و بەسەر ئاقارێکی فراوانتر لە ئاقاری ناوچەییدا پراکتیزە بکرێ، بۆ ئەم ئامانجەش ئەو قانونیە مەدەنییە ڕۆمانییەی کەوا "گۆستنیان داینابوو تۆمارکراو، ئەم پێشکەوتنەش هێندەی تر سەقامگیربوو کاتێ قانوونی مەدەنیش لە زانکۆکانی ئیتالیادا وەکو وانە دەگوترایەوە و دواتریش گوازرایەوە بنکەکانی دیکەی فێربوون.

تێکڕای ئەمە بووە هۆی پێشکەوتنێکی قانوونیی گەلێ نەرم لە ئەوروپای فیوداڵیدا و چیتر بیرۆکەی قانوونی عورفی نووسراو و نەنووسرا، دلڕەق و وشك، لەلایەن عورف و خووەکانی ئەوکات پشتیوانی لێنەدەکرا، جا لە شانشینە فیوداڵەکاندا قانوون هەر بە عورفی لەقەڵەمدرا و بڕیارە قانوونیی و دادگەرییەکانیش تەنها ئامرازی جۆراوجۆربوون بۆ جاڕدانی عورفە دێرینەکان یاخود ئەفراندنی عورفی نوێ، ڕەنگە بارۆنەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٢٣٦دا جاڕیان دابێ "ئێمە حەز بە گۆڕینی قانوونەکانی ئینگلتەرا ناکەین" کەچی ئەوان هیچ گومان لە دەسەڵاتی مەلیك و بارۆنەکانی ناکەن کە ئاخۆ ئەمە ویستی ئەوانە لە جاڕدانی عورفی نوێ، سەرەڕای ئەمە ئەو خێراییەی کەوا کۆمەڵگای تێدا دەهاتە گۆڕان نەرمییەکی مەزنی بە عورفە نەنووسراوەکان بەخشی، ئەوەبوو عورف پێویستی بەوە نەبوو نووقمی کۆنی بێ تاوەکو مولزەم و شیاوبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، عادەتێك (دە) یا (بیست) ساڵی بەسەردا تێپەڕیبووایە دەبووە (عادەتێکی کۆن و دواتریش عورف).



## قانوونی عورفی (قانوونی گشتی) و عورفی قانوونیی

## (Common Low and Customary Low)

لە بارودۆخێکی وەکو ئەمەدا هەبوونی موڵکییەتێکی بەهێز، هێزی قانوونی ناوەندی و کارگێڕی ناوەندی زێتر دەکا و دەبێتە هۆی ئەوەی قانوونی پادشاهی کەوا دادگەرانی مەلیك پراکتیزەی دەکەن و وا دەکەن (ئاشتی مەلیك باڵی بەسەر تەواوی مەملەکەتدا بکێشێ) جێگەی قانوون عورفییە خۆجێیە پەرتەوازەکان بگرێتەوە لە فیوداڵییەکاندا. یەکێ لە دەرەنجامەکانی فتوحاتی نورماندی و دروستبوونی موڵکیەتێکی بەهێز لە بەریتانیادا خێرایی پێشکەوتنی خودی بەریتانیا بوو زێتر لە هەر وڵاتێکی دیکەی کیشوەری ئەوروپا، لەوێدا قانوونیەکی عورفی بۆ تەواوی شانیشینەکە هاتەکایەوە، بەمەش عورفە خۆجێییەکان وەلانران و قانوونی باڵادەست "قانوونی عورفی شانشین"ەکە بوو، قانوونی عورفی "یاسی گشتی" قانوونیەکی عورفی نەبوو بەو واتایەی کە مەبەستە لەو قانوون عورفییانەی شوێنی ئەویان گرتەوە، یاخود ئەو قانوونیانەی لە کۆمەڵگا بەراییەکاندا هەبوون و پێشتر باسمان کردن، بەڵکو ئەو کات و تا ئێستاش بەرهەمی لاساییکردنەوەیەکی پیشەیی قانوونیی ڕۆشەن بوو، ئەگەرچی تۆماریش نەکرابوو بەو واتایەی کە داڕێژراو نەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا گەڵێ بڕیاری دادوەری تۆمارکراوی لەخۆگرتبوو کە نایەتە ئەژمار، لە هەمانکاتدا مایەی ڕاڤەکردنێکی نەپساوە بوون کە بووە هۆی سەرهەڵدانی پرەنسیپی قانوونیی کە بەسەر ئەو حاڵەتە نوێیانەی سەریانهەڵدەدا پراکتیزە دەکران.

قانوونیەکی وەکو ئەمە بە هەمان شێواز لەدایك نابێ کە پێشتر باسمان لێکرد، واتە لە ڕێگەی ئەو پرەنسیپ و پێودانگانەی لە کۆمەڵگە بەراییەکاندا سەریانهەڵدەدا و دەبوونە هێزێکی مولزەم لە ئەنجامی بەردەوام ڕەچاوکردنیان بە حوکمی عادەتەوە

لەدایك نابێ. چونكە ئەو پرەنسیپانە یاخود ئەو پێودانگانە لە خوارەوە رادەسپێنرێن، بەڵام ئەو بڕیارانەی دادگا دەریاندەكا، بەپێی قانوونی گشتی، لەسەرەوە دەردەچن.

لەگەڵ ئەوەشدا، سیستەمێكی وەك ئەو قانوونیە عورفییە، بە تایبەت لە قۆناغەكانی بەراییدا, پردێك بوو لە نێوان قانوونی عورفی رەسەن و سیستەمی قانوونیی بە قانوونكراوی (مقنن) هەرە پێشكەتوو لەگەڵی دەوڵەتی تازەدا، دادوەران لە بۆشاییدا كارناكەن، ئەمەش وا دەكا ئەو پرەنسیپە قانوونییانەی كەوا پێشانخستوون و پراكتیزەیان كردوون تا رادەیەك رەنگدانەوەی ئەو هەست و عورف و خووە پەسندكراوانە بن لەو كاتدا، وێڕای ئەمە پشتیوانیكردنی یەكسەرەی ئەو بڕیارانەی دادوەران دایدەڕێژن بەبێ بایەخدانە پێودانگەكانی كۆمەڵگا و خووەكانی ناشێ پەسند بكرێن بێ ئەوەی بە چاوی گومانەوە سەیر نەكرێن، چونكە قانوونی دادگەری مەیلی هەیە برێ سەربەخۆیی خۆی لە ئەنجامی ئەو تەكنیك و سازگاری و پووختكردنەوەی پێگەشتووەو، هاوكات لە ئەنجامی ئەو رایە قانوونییە پیشەییەیە كە بە تەواوەتی جیاوازە لەو چارەسەكردنە ساویلكەیەی مرۆڤی ئاسایی پێی دەڕوانێتە ئەو چەوت و راستانەی لە پەیوەندییە كۆمەڵایەتییە رۆژانەییەكانیدا ئەنجامی دەدات، رۆژ لە دوای رۆژ ئەم تەكنیك و وردەكارییە سەفامگیرتر و فراوانتر دەبێ و كەم كەمە قانوون لە راستییەكانی ژیانی رۆژانە دووردەخاتەوە، لە داهاتوودا ئەم حاڵەتە بە شێوەیەكی تایبەت لە قۆناغی پێشكەوتنی قانوونییدا دەبینین كە چاكسازی قانوون لە رێگەی قانووندانانەوە ئەنجام نادرێ تەنها لە حاڵەتە دەگمەنەكاندا نەبێ، هەوڵی قانوونی عورفی (قانوونی گشتی) سەبارەت بە دەربازبوون لەو بنبەستەی كە خۆی بۆ خۆی دروستی كردووە تاكو بكرێ بەسەر پێداویستییە نوێیەكاندا پراكتیزە بكرێ، مەیلی ئەوەی هەیە پەنا بەرێتە بەر خەیاڵی نەگونجاو و ماندووكەرە، ئەم كارەش بۆی هەیە وا لە قانوون بكات دوورتر



بكەوێتەوە لە راستی. دەكرێ ئەمە بە شێوەیەكی تیروتەسەل، لە رێگەی بەكارهێنانی فێڵە قانوونییەكان روون بكرێتەوە، هەروەكو (كرێچی شێوەكی) یان ئەركە خەیاڵییەكان بە مەبەستی بەدیهێنانی هەندێ مەرامی سادەی وەكو مافی موڵكدار لەوەی كە بانگەشەی دەستبەسەرداگرتنی زەوییەكەی بكا و بە هی خۆی بزانێ لە بەرامبەر دادگاكاندا.

سەرباری ئەمە پێویستە لەوە تێبگەین كە دادوەران نوێنەری سەرجەم خەڵك نین، بەڵكە لە چینی فەرمانرەوایان یاخود لە چینی دیاریكراوی موڵكداران گۆڵبژێر كراون، بە شێوەیەك ئەو ئایدۆلۆژیایەی لە قانووندا دایدەچەقێنن رەنگدانەوەی رەفتاری ئەو چینەیە، بۆیە سەخت نییە درك بەوە بكەین كە بۆچی قانوونی زەوی و زار پیرۆزی و پایەیێكی تایبەتی هەبوو لە قانوونی عورفی دێریندا (قانوونی گشتی)، هەروەها پێشخستن و پراكتیزەكردنی قانوونی سزاش لەمبارەیەوە بایەخی كەمتر نەبووە، چونكە وا سەیری بە پەت هەڵواسینی منداڵە بچووكەكانی دەكرد كە شەڕێكی سووكترە لە هەڕەشەكردن لە ماڵ و سامان لە رێگەی دەستبەسەرداگرتن و بەتاڵانبردنی.

## رۆڵی عورف لە قانوونی تازەدا

كاتێك سەیری رۆڵی عورف دەكەین لە سیستەمی قانوونیی تازەی ئاست بەرزی پێشكەتوو، ئەوا سەرمان ناسووڕمێ كاتێ دەبینین عورف تەنها شوێنێكی لاوەكی هەیە، ئەوە ئەگەر بە كردە شوێنی هەبێ، وەكو سەرچاوەیەكی لە سەرچاوەكانی رێسا قانوونییە نوێیەكان، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر ئێمە ئەو پەیوەندییە سۆسیۆلۆژیانە لێكجیا بكەینەوە كەوا قانوون دانراوەكان بایەخی پێدەدەن لەمەڕ تەونی ناوەوەی ژیانی كۆمەڵ و لەگەڵ ئەوەشدا بەها بنچینەیی و رەفتارەكانی ئەو

شێوازانەی خووە کۆمەڵایەتییەکان (العادات الاجتماعیە) وەکو سەرچاوەیەکی داهێنەرانەی راستەوخۆی سەرچاوەکانی قانوون کارپێدەکەن، لە فەسڵێکی پێشوودا بە تێری لەمەڕ بەشی یەکەم دواین، لێرەشدا دەپرژێینە سەر رۆڵی عورف وەکو سەرچاوەیەکی قانوون.

## عورفی خۆجێیی

سێ لایەنی سەرەکی هەنە کە عورف تێیاندا سەرچاوەیەکی راستەوخۆیە لە سەرچاوەکانی قانوون تەنانەت لە چەمکی دەوڵەتی تازەشدا، یەکەمیان لە رێگەی دانپێدانانە بە عورفی خۆجێیی و بەخشینی هێزی پەیوەستبوونە پێی، کە لە داهاتوودا بۆمان روون دەبێتەوە کە لە سایەی سیستەمێکی قانوونیی گشتی لە دەوڵەتێکدا کە خودان دەزگای قانووندانانی تایبەتکار و دیاریکراوبێ ئەوا عورفی خۆجێیی هیچ رۆڵێکی نییە وەکو سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکان قانوون، هەندێ لە قانوون سڤیلە تۆمارکراوەکان لە کۆمەڵێ دەوڵەتی هاوچەرخدا عورفی خۆجێیی رەتدەکەنەوە وەکو سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی قانوون، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە عورف ناکۆکە لەگەڵ یەکپارچەیی قانوون کە ئامانجی تۆماری قانوونییە، ئەگەرچی قانوونی عورفی بەریتانی خووی گشتی (العادە العامە)ی رەتکردەوە، وەلێ هێشتا دەرفەتێکی دیاریکراوی هێشتۆتەوە بۆ کارپێکردنی عورفی خۆجێیی، پێویستە لەسەر عورفی خۆجێیش لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوێ و بەسەر گەلێ سەختی قانوونیی دلڕەقانەدا بازبدا تاکو دانیپێدا بنرێ کە ئاکارێکی قانوونیی بکەرە، یەکێ لە کۆی ئەو کۆسپانەش کە لە پێشیدایە ئەوەیە کە بیسەلمێنێ "ریشەکانی" شۆڕدەبنەوە نێو سەردەمێکی هەرە دێرین، واتە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی ١١٨٩ی زایینی، دادگاکان پەنا دەبەنە بەر باسکردنی



مەسەلەکە بە سادەیی و دەڵێن: ئەو عورفەی ئاوەز پەسندی بکا عورفێکی چاکە، رۆشەنە کە ئامانج لە تاقیکردنەوەی یەکەمی تاقیکردنەوەکانی کەمکردنەوەی ئەو حاڵەتانەیە کەوا عورف تێیاندا رۆڵێکی تا بشێ کەمی هەبێ، هەروەها گەرەنتی ئەوەش بکا کە دادگاکان تا رادەیەك سانسۆر بخەنە سەر عورف بۆ ئەوەی بڕیار بدەن کە ئایا عورف شەرعییەتی قانوونیی پێدەبەخشرێ، تا ئێستاش دادوەرانی بەریتانیا گیرۆدەی دەستی ئەو مقۆمقۆیە نەزۆکەن لەمەڕ ئەو مەسەلەیەی کە ئایا عورف بە حوکمی خۆیی و لە خودی خۆیدا رەوایە یاخود بە حوکمی دانپێدانانی دادگەیەکی قانوونیی.

لە پێشدا بینیمان قانوونی عورفی راستەقینەی شێوازی دێرین بە حوکمی خۆیی و لە خودی خۆیدا مولزەمە و بە تەواویش سەربەخۆیە و پێویستی بە پەسندکردن و دانپێدانانی قانوونیی نییە و لە سایەی نەبوونی سیستەمێکی دادگەریشدا هەر کاردەکات، بەڵام ئەوەی راستی بێ قانوونی بەریتانی تازە ئەو دەسەڵاتە دەداتە دادگا تاکو دەستنیشانی بکا کە هەر عورفێ پەسندە یان ناپەسندە.

ئەمەش بە روونی رۆشەنی دەکاتەوە، کە عورف نە تەنها سەرچاوەیەکی لاوەکی قانوونیە، بەڵکو بە هەر شێوەیەکیش بیری لێبکرێتەوە، ئەوا دەسەڵات و قانوونیی بوونی خۆیشی لە دادگاکانەوە وەردەگرێ نەوەکو لە خودی خۆیدا، جا ئەگەر دادگاش بە دروستی نەزانێ ئەوا وەك نەبوو وایە.

## خووە دەستوورییەکان

شتێکی گرنگتر لە عورفی خۆجێیی هەیە ئەویش رۆڵی عورفە لە بڕیاردانی مومارەسە دەستوورییەکان، ئەمەشیان شایانی بایەخ پێدانە، لە وڵاتێکی وەکو بەریتانیادا کە خودان دەستوورێکی نووسراو نییە، ئاکارە سەرەکییەکانی دەستووری

بەریتانی وەکو سەروەری پەرلەمان و بنەما پەرلەمانییەکان و بەشێك لەو ئەحکامانەی کەوا مولکییەت و دۆخە دەستوورییەکەی ڕێکدەخەن و دەسەڵاتی دادگاکان لە بەرەوپێشبردنی قانوون, هەموو ئەو باسانە پشت دەبەستن بە مومارەسە عورفییە سەقامگیرە دێرینەکان کە هیچ گومانیشی لێناکرێ بەپێی قانوون مولزەمن و پێویستە لە حوکمە دەستوورییە ڕەچاوکراوەکان جیابکرێنەوە کە هەرچەندە سیفەتی ئیلزامیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی قانوونییان نییە، ئیدی واژووکردنی ئەو قانوونیانەی کە هەردوو ئەنجوومەنی گشتی و لۆردەکان بەبێ گۆڕان پەسەندی دەکەن لەلایەن مەلیکەوە و دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆك وەزیران کاتێ لە ئەنجوومەنی گشتیدا سەرناکەوێ و متمانەی لێدەسەنرێتەوە، دوو ئاکارن لە ئاکارەکانی دەستوور و کەسێ بیر لەوە ناکاتەوە سووکایەتیان پێبکات، بەڵام ئەم دوو ئاکارە ڕێسای قانوونیی نین بەو واتایەی کە بەشێك بن لەو پرەنسیپە قانوونییە زنجیرەییانەی سیستەمی قانوونییان لێ پێکدێت، لەبەرئەمە پێویستە لە ڕووی سیاسییەوە، لەوانەشە لە ڕووی ئەدەبییەوە بە مولزەم ڕەچاو بکرێن، بەڵام لە ڕووی قانوونییەوە مولزەم نین.

سەرباری ئەمە هەتا لەو لایەنەشدا کە پەیوەندیدارە بەوەی کە ئەو حوکمە دەستوورییە عورفییانە پرەنسیپی قانوونیی سەقامگیرن یا نا، ئەوا پێویستە ملکەچی ئەوەبین کە ئەو حوکمانە لەلایەنی ڕەوایەتیدا قەرزداری پەسندکردنی کۆمەڵ نین بەوەی کە کاریان پێدەکا و پێڕەویان دەکا، بەڵکو قەرزداری نەوە لە دوای نەوەی چینی فەرمانڕەوا و دادوەران و پیاوانی قانوونن، هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە ڕەشەی خەڵك ڕەنگ پەسندیان بکا و پێیان ڕازیبێ یان بە لایەنی کەمەوە ملکەچیان بێ، بەڵام ڕۆڵەکەی نێگەتیڤە بە پێچەوانەی ئەو ڕۆڵە پۆزەتیڤەی کە خووی پابەندبوون بە مومارەسە عورفییەکان پێویستی پێیەتی.



## عورفی بازرگانی

لە کۆتاییدا عورفی بازرگانی دێتە پێش، لە ڕابردوودا عورفی بازرگانی ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی بینی لە پێشکەوتنی قانوونی بازرگانیدا، وا پێناچێ ئێستا هیچ دەرفەتێك هەبێ کە عورفی بازرگانی ڕۆڵێکی تێیدا کار بکاتە سەر گۆڕینی قانوونی بازرگانی گشتی، لە بەریتانیادا دوایین نموونە لەمبارەیەوە لە ساڵی ١٨٩٨دابوو کاتێ ئەو سەنەدانەی دەکرێ بدرێنە هەڵگرەکەی (السندات القابلة للدفع للحامل) بە گوێرەی عورفی بازرگانییەوە بە سەنەداتی شیاو دادەنران بۆ دەستاودەست پێکردن (سندات قابلة للتداول) گەلێ کەرەستەی گرنگی دیکە هەبوون کە بە هۆیانەوە عورفی بازرگانی کاری پێدەکردە سەر قانوون، ئەمەشیان لە ڕێگەی گرێبەستە بازرگانییەکانەوەی بە ئەنجام دەگەیشت و مەرجەکانیش لەو گرێبەستانەدا لە ڕێگەی سەقامگیرکردنی عورفێك لە عورفە بازرگانییەکانەوە گەرەنتی دەکرا، ئیدی بۆ ئەوەی گرێبەستی بازرگانی کارابێ، پێویست بوو وایدابنێن کە گرێبەستەکان لەسەر بنەمای پتەو و سەقامگیری مومارەسە بازرگانییەکانەوە دامەزراون، بەم شێوەیە بڕیارەکانی دادگەکان و دادوەری بازرگانی دەتوانن لە کاریگەری گۆڕانکارییەکان بەسەر خووەکان و مومارەسە بازرگانییەکاندا تێبگەن، ئەگەرچی ئاستی ئامادەگی دادگاکان سەبارەت بە پەسندکردنی پێشکەوتنەکان لە کۆمەڵگای بازرگانیدا تا ڕادەیەکی زۆر دەوەستێتە سەر ئەو داب و نەریتە پیشەییانەی کەوا سیستەمی قانوونیی تایبەت بە مەسەلەکە هەیەتی، پێویستی بوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە تایبەتە لە نێوان قانووندانەرانی قانوونی دانراو و (القانون الوضعي) دادگەرانی و لە نێوان جەوهەری مومارەسە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە وایکرد کۆمەڵناسێکی وەك (ئارلیش) جەخت بکاتەوە سەریان، کاتێ باسی لە جەوهەری مومارەسە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە کرد و پێوابوو شێوەیەکە لە شێوەکانی "قانوونی

زیندوو" راستییەکەشی ئەوەیە گرێبەستە بازرگانییەکان یەکێ لە ئاکار و تایبەتمەندییە زاڵەکانی پەیوەندییەکانی (کار)ن، گوزارە لە گرنگی بێلایەن نەبوونی قانوونیی بازرگانی دانراو دەکەن کە بەلای ئەو گریمانە بنچینەییانەدا دەشکێتەوە کە جۆرە جیاوازەکانی مامەڵە بازرگانییەکان پشتی پێدەبەستن، رەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ شکستی ئەو دادوەرانەی وەکو پێویست مەعریفەی راستەوخۆیان بە جیهانی بازرگانییەوە نییە لە (پێکەوە گرێدانی پەیوەندی نێوان قانووندانەرانی قانوونی بازرگانی و جەوهەری مومارەسە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە)، هەر ئەمەش وایکردووە ئارەزووی دوورکەوتنەوە لە دادگاکان بێتە ئارا و لەو ساڵانەی دواییدا رووبکرێتەوە داوەریی بازرگانی (التحکیم التجاری).

## گرێبەستە نموونەییەکان

شێوازێکی دیکەی زیندوو هەیە کە کۆمەڵی بازرگانی دەتوانێت، بە شێوەیەکی نیمچە رەوا، لە رێگەی گرێبەستە نموونەییەکانەوە مومارەسە تایبەت و پێداویستییەکانی خۆی لەگەڵی لە مامەڵەکاندا بسەپێنێ، ئەم جۆرە گرێبەستە پێکدێت لە نموونەیەکی چاپکراو، مەرجی یەکگرتووی تێدایە و ئێستاش لە جیهانی قانوونی هاوچەرخدا بۆتە شتێکی باو، وا وێنا دەکرێ کە لایەنی داواکراو سەبارەت بە واژووکردنی گرێبەستێکی ئاوەها ئازادە لەوەی گرێبەستەکە واژوو بکا یان نەیکا، کەچی هەڵبژاردن لە نێوان ئەوەی کە وەری بگرێ یان وازی لێبێنێ هەڵبژاردنێکی ناڕاستە بۆ ئەو کەسەی کە ناتوانێ تەنها مومارەسەی مافی رەتکردنەوە بکا (واتە لە راستیدا تەنها مافی قبووڵکردنی هەیە) و لە بەرامبەر ئەو کار و خزمەتگوزارییانەی کە ناتوانێت لە رێگەیەکی دیکەوە دابینیان بکات و



بیانڕەخسێنێ، لەبەر ئەمە ئەم جۆرە گرێبەستانە دەمانگێڕێتەوە بۆ بە پیرۆز زانینی چەمکی دێرینی ئازادی گرێبەستن، ئەو ئازادییەی لەگەڵیَ لە گرێبەستە دیاریکراوەکاندا بە توندی دەستدرێژی کراوەتە سەر لە رێگەی ئەو دەقە قانوونییەی کە گوایە مەبەستی بووە بەکارهێنەر (مستهلك) بپارێزێ، هەروەکو لە گرێبەستەکانی کڕینی بە قستدا.

رەنگە ئامانجی هەندێ لەو گرێبەستە نموونەییانەی کەوا لەلایەن چەند دەستەیەکی سەربەخۆ یان پیشەییەوە ئامادە دەکرێن، پتەوکردن یاخود سەقامگیرکردنی باشترین و دادوەرانترین مومارەسە و رێسا بێ کە دانپێدانراوە لە بواری چالاکیدا، وەکو ئەو گرێبەستانەی بیناسازی کە پێشتر لەلایەن ئەنستیتۆی مەلەکی ئەندازیارە بیناسازەکانی بەریتانیا ئامادەکراون، دەشێ بڵێین ئەو جۆرە گرێبەستانە باشترین بەکارهێنانی بازرگانی یان پیشەیی کە لەلایەن ناودارترین ئەوانەی کە ئەو پیشەیە مومارەسە دەکەن، بەرجەستە دەکا، هەرچۆنێ بێ ئەوا داهێنانی بەشی هەرەزۆری ئەو گرێبەستانە بە ئامانجی پتەوکردنی ئەو رێسا و ئەحکام و خوانە بوو کەوا بە شێوەیەکی نایاب بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی پیشەسازییەکان و هاوردەکان دەپارێزن، پتر لەوەی کە مەبەستیان بووبێ پارسەنگییەك بخوڵقێنن لە نێوان پێویستی و مومارەسەی کۆی بایەخدەران، لەوانەش "بەکارهێنەر- مستهلك"ی هەژار، ئەم گرێبەستانە سوود تەنها بە لایەنێك دەبەخشن کە ئەویش ئەو لایەنەیە کە خودانی هێز و سەرچاوەکانە تا بتوانێ ویستی خۆی بەسەر بەکارهێنەراندا بسەپێنێ، لە هەمانکاتدا زۆر کێشەی نوێ و ئاڵۆزیان خوڵقاند کە تا ئێستاش چارەسەرکردنیان بەدوور دەزانرێ، زۆربەی دەوڵەتان لەم دواییانەدا بە ئەنقەست پەنایان بردە بەر داڕشتنی چەند قانوونێك کە مەبەست لە داڕشتنیان کۆتکردن و کپکردنی خراپ بەکارهێنانی ئەو گرێبەستانەیە و رێگەگرتنە لە بەردەم ئەو لایەنە خراپانەی کە لێیان دەکەوێتەوە.

## عورف له قانوونی نێودەوڵەتیدا

له کۆتاییدا شتێك هەیه له بارەی ئەرکی عورف له قانوونی نێودەوڵەتی هاوچەرخدا دەگوترێ، لەلایەنی تیۆرییەوە بینیمان که قانوونی نێودەوڵەتی متمانه دەکاته سەر ئەو عورفانەی بەرە بەرە پێگەشتوون و پێشکەوتوون و له نێو دەوڵەته مەدەنییەکاندا باڵادەست بوون، له نێو ئەوانەشدا ئەو رێسا عورفییەی که دەڵێ: پەیماننامەکان پێویسته له رووی قانوونییەوە به مولزەم دابنرێن.

ئید لێرەوە قانوونی نێودەوڵەتی شێوەیەکه له شێوەکانی قانوونی عورفی و وەکو شێوە دێرینەکانی قانوونی عورفی وایه، هیچ دیاریکردنێکی تێدا نییه، واته ئەو هۆکارانەی دیارنەکردووە که له رێگەیانەوە مومارەسه و خووەکان بەپێی قانوون دەبنه عورفی مولزەم، لەبەر ئەمه سەیر نییه کاتێ ببینین له سایەی ئامادە نەبوونی دەزگایەکی جیهانی پەسندکراوی خودان دەسەڵاتی جاڕدان یان بڕیاردەری رێسای عورفی قانوونیی سەقامگیر، گەلێ له پرەنسیپه زیندووەکانی قانوونی نێودەوڵەتی مایەی مشتومڕێکی توندن و پێشبڕکێکارانیش، چ تاك تاکی دەوڵەتان بن یان کۆمەڵێ له دەوڵەتان، کاردەکەن بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری بەیانات و بەڵگەکان که دەبنه پشتیوانی هەڵوێستی ئەو دەوڵەته یان ئەو کۆمەڵه دەوڵەتەی که حەز دەکەن پشتیوانیان لێبکەن، بۆیه نابێ جیاوازییه زەقەکانی نێوان قانوونی نێودەوڵەتی و قانوونی عورفی دێرین فەرامۆش بکرێن، قانوونی نێودەوڵەتی- وێڕای ئەو هەموو لەرزۆکی و کارانەبوونیەی- قانوونیەك نییه، ئاراستەی تاکەکان بێ وەکو تاك، هەروەها ئاراستەی پیاوانی هۆزە بەرابییەکانیش نییه، بەڵکو قانوونیەکه فەرمانڕەوایی پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو یا نیمچه پێشکەوتوو دەکات.

به شێوەیەکی ئاڵۆز و زۆر به بایەخەوە وردەکاری (تمحیص) له ئەحکامەکانیدا دەکرێ، واته به دیراسەکردنی نموونەی مێژوویی و پێشینەی مێژوویی و (السابقة التأريخية) راڤەکردنی پەیماننامەکان و بەڵگەنامەکانی دەوڵەت و بەڵگەی دیکەی پەیوەندیدار به بابەتەکەوە به شێوەیەکی قانوونیی، هەروەها له رێگەی گەڕانەوە بۆ حوکمەکانی دادگا نێودەوڵەتییەکان و بڕیار و رای دەسته نێودەوڵەتییەکان و دەزگاکانیان و نووسینەکانی زانایه رۆشنگەرەکان و بۆچوونەکانیان دەڕوانێته ئەحکامەکانی خۆی، ئا لێرەوە بوو تێکەڵاوییەکی سەیر له نێوان کارگێڕی قانوونیی ناپێشکەتوو لەگەڵ زرنگی راڤەکردنێکی پووختکراو بووە دیاردەیەکی بەرچاوی قانوونی نێودەوڵەتی لەم سەردەمانەدا.

## عورف و خوێندنگەی مێژوویی

پێشکەوتنی فرەی عەقڵانییەت له سەردەمی رۆشنگەریدا، له سەدەی هەژدەهەم، بووە هۆی کاردانەوەیەك که بزاڤێکی ئەفراند پێی دەگوترێ بزاڤی رۆمانسیزم، بزاڤەکه له دەستپێکدا ئەدەبی و هونەری بوو له بەرژەوەندی هەست و خەیاڵ، بەڵام هێندەی پێ نەچوو به خێرایی هەستێکی نارۆشەنی لەمەڕ پێشکەوتنی ئۆرگانێکی دامەزراوە مرۆییەکان و ئەو هێزە نامۆیه نەبینراوانەی کۆمەڵگا دەجولێنن وەپێشخست، دەبینین که لەلای "بیرك"دا گوزارەیەکی بریقەدار و گەیەندراو هەیه سەبارەت به بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی و پێیوایه دەرەنجامێکی روونی رەزامەندی ئازادانەی عەقڵانییەت نییه، بەڵگه کیانێکی مێژوویی ریشەقووڵی عورفه، خودانی یەکێتی ئۆرگانێکی و بەهاکانی خۆیەتی و له سەرەوەی هەموو ئەو تاکانەدایه که لێیان پێکدێ، هەروەها له سەرووی بەهاکانی ئەواندایه له هەر قۆناغێك له قۆناغەکانی پێشکەوتنی ئەو کیانەدا.

بیرۆکەی قانوونی ئۆرگانێکی و دەوڵەت زەمینەی به پیتی خۆی له ئەڵمانیا دۆزیەوە (ئەوەبوو "هیگڵ" بیرۆکەی خۆی له بارەی پرەسیپی دەوڵەت بنیاتنا، ئەو

پێیوابوو دەوڵەت بوونەوەرێکی زیندووە و لە خودی خۆیدا ئامانجێکە و باڵاترین بەرجەستەی ئاوەزی مرۆڤە. ئەم دەوڵەتە بەرهەمی ئەو هێزە مێژووییە مەزنانەیە کە لە نێو مستی ئەو هزرە گەردوونییەدان کە جوانترین شێوەی بەرجەستەبوونی لە مەملکەتی "بروسیا"دایە، کە لەوێدا "هیگل"ی فەیلەسووف سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی ئینجیلی نوێی خۆی بوو)*. لایەنی تراژیدیای ئەم فەلسەفە مێژووییە لەوەدایە کە رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پەرستنی تۆلیتاریزمی تازە و لێرەشدا دەرفەتی باسکردنیمان نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناتوانین خوێندگەی مێژووی ئەڵمانی فەرامۆش بکەین کەوا سەنگێکی گەورەی هەبووە لە چەمکی بنچینەیی هیگلیزمدا.

دیارترین کەسایەتی ئەم خوێندنگەیە (ساڤینی)یە کە زانایەکی دیاری ئەڵمانی بووە و ناوی لە نیوەی یەکەمی سەدەی رابردوو بریسکاوەتەوە، پێیوابوو قانوون چکانەوەی ئۆرگانێکی رۆحی ئەو گەلەیە کە لە ناویدا کار دەکا نەوەکو بەرهەمی قانووندانەرێکی دروستکرا. بەڵام تاکە قانوونی شایستە بەم بیرۆکەیە، قانوونی عورفییە، هەر لەسەر ئەمەش ساڤینی و پێڕەوانی متمانە و باوەڕی خۆیان داکوتا.

قانوونیەکی وەکو ئەمە دەبێ وا لێی تێبگەین کە بەرهەمی پرۆسەیەکی مێژوویی درێژ و بەردەوامە، دەسترۆیشی متمانە دەکاتە سەر ئەو تایبەتمەندێتییە عورفییەی کە هەیەتی و ریشەی داکوتاوە لە ویژدانی میللیدا، بەمەش دەبێتە ئەو قانوون نیشتمانییە راستەقینەیەی کە رێکە و لەگەڵ گیان و بیری میللەتدا دەگونجێ. لێرەوە بە چاوی گومانەوە سەیری قانووندانان دەکرێ، چونکە بە دەستێوەردانێکی توند دادەنرێ، لە پێشکەوتنی بەرەبەرەیی پرەسیپە عورفییە مێژووییەکان. بە

* برگەی نێوان کەوانە بە کەمێ دەسکارییەوە وەرگێڕراوە بە مەبەستی زێتر روونبوونەوەی بیرۆکەی "هیگڵ" لەمەڕ دەوڵەتدا - و-



قانوونکردن، بە تایبەت لە دوای بڵاوبوونەوەی شۆرەتی بەقانوونکردنی قانوونی مەدەنی لە ساڵی (١٨٠٤)دا لەلایەن (ناپلیۆن)ەوە، بە کارێکی ناحەز ئەژمار دەکرا، چونکە ئاژاوەی خستە نێو ئەو قانوونیە فەرەنسییەی کە لە سیستەمی کۆندا دەسترۆ بوو، هیچ گومانی تێدا نییە کە چارەسەکردنی مێژوویی بەشدارییەکی گەروەی کردووە لە هزری قانوونیی تازەدا.

چونکە جارێدا کە قانوون کۆمەڵێکی ئەبستراکت نییە بە تەنها ئەو حوکمانە بگرێتە خۆی کە بەسەر کۆمەڵەدا سەپێنراون، بەڵکو بەشێکی تەواوکەرە لەگەڵ کۆمەڵگەدا، ریشەی قووڵە لەو سیستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەی کەوا لە چوارچێوەیدا بەهای تەقلیدییەکان بەرجەستە دەبن و واتا و ئامانج دەبەخشنە هەر کۆمەڵگەیەك، لێرەشەوە روون دەبێتەوە کە پەیوەندی هەیە لە نێوان تێڕوانینی مێژوویی و دوایین تیۆری مارکسیزم لە بارەی قانوون و (کە بەرهەمی هزری هیگڵیزمە) زانستی سۆسیۆلۆژیای تازەدا، لە هەمانکاتیشدا ئەو پەراوێزە زیندووە هەر دەمێنێتەوە لەوێدا، ئەویش ئەوەیە کە لە کاتێکدا چارەسەرکردنی مێژوویی سەیری دواوە دەکا و دەگەڕێ بە دوای پێشینەی مێژوویی و قانوون بەو شێوەیە راڤە دەکا کە لە کۆمەڵگایەکی تازەدا چۆن پێشکەوتووە، ئەوا تازەگەرەکانی ئەم خوێندنگەیە سەیری پێشەوە دەکەن و بایەخ نادەنە بنچینەی مێژوویی قانوون. جا چ بۆ راڤەکردن بێ یاخود بۆ پاساوهێنانەوە بۆ ئەو حوکم و رێسایانەی کەوا هەن، بەڵکو بایەخ دەدەنە لە قاڵبدانی قانوون تاوەکو لە توانایدا هەبێ چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بکات.

لەبەر ئەم هۆیەش "هۆڵمز"ی دادوەر هێرشی کردە سەر میتۆدی مێژوویی لە گوتە بەناوبانگەکەیدا کە دەڵێ: ئەوەی کە مایەی بێزلێبوونەوەیە ئەوەیە کە هۆیەك نییە بۆ هەبوونی رێسا باشتربێ لەو هۆیەی کە دەڵێ لە سەردەمی هێنری چوارەمدا دانراوە!![1]

١- لەم وتەیەدا توانج لە رەگەزی (کۆنی) دەدا - و-

## گەل

جگە لەوەی کە لە پێشدا باسمانکرد خاڵێکی دیکەی لاوازی گەورە هەیە لە چەمکی ئەڵمانی سەبارەت بە خوێندنگەی مێژوویی، ئەویش ئەوەیە کە بە گەورەیی چەق دەبەستێتە سەر چەمکی گوماناوی "گەل" کە پێیوایە کیانێکی تایبەتمەندە (کیانا متمایزا) و کیانێکی جەماعیییە لە چەمکی (ویستی گشتی)، دەچێ لەلای "رۆسۆ"دا و کە ئەویش رۆمانسیستێکی دیکەیە —خودان هۆشیارییەکی بە کۆمەڵی سەیرە کە بەرهەمەکەی هەر بە تەنها زمان و ئەدەب و هونەر نییە، بەڵکو تێکڕانی دامەزراوە نیشتمانییەکانیش دێنێتە بەرهەم لەوانەش قانوون. وشەی (فۆلك- volk)ی ئەڵمانی لەمبارەیەوە بۆ خۆی وشەیەکی نارۆشەنە، نادیاری تێدا و زیاتر لە واتایەك دەبەخشێ، لەوانەیە واتای گەل و نەتەوە و رەگەز و کۆمەڵەیەکی نەژادی بگەیەنێ، سەرباری ئەوەی کە کۆمەڵانێکی تایبەتی رەگەزی مرۆیی بەشداربوون لە دروستکردنی رۆشنبیری و پێشخستنیدا، بەڵام چیتر ناشێ هیچ بوارێك لە بوارەکانی رۆشنبیری و قانوون مۆرکی نەتەوەیەکی گۆشەگیر یاخود گروپێکی نەژادی دیاریکراوی پێوە بلکێنرێ، رەنگە نزیکترین نموونەی ئەمەش لە جیهانی خۆرئاوای هاوچەرخدا پێشکەوتنی قانوونی عورفی (قانوون گشتی) (نیشتمانی) بێ لە بەریتانیادا, بەڵام سەختە، بەڵکە مەحاڵە, پۆلکاری سروشت و پێکهاتەی ئەو گەلە بکەین کە ئەم قانوونیەی ئەفراند، ئەگەرچی بە دڵنیاییەوە (ئەم قانوونیە) بەرهەمی هۆشیاری و درککردنی بە کۆمەڵی گەل نییە، بەڵکو تا رادەیەکی زۆر بەرهەمی پێشخستنی گروپێکی بچووکی پارێزەری پرۆفیسیۆنالە، هەر "ساڤینی"یش بوو پێشبینی ئەم سەختییەی کرد و هەر ئەویش بوو گوتی: پێشکەوتنی قانوونی عورفی، لەسەر ئاستی پیشەییدا، بە هەوڵی ئەو زانا و دادوەرانە هاتەدی کە رۆڵی دەزگاکانی هۆشیاری میللی و نەتەوەییان بینی، بەڵام ئاڵۆزی قانوون و وردەکارییەکانی لە کۆمەڵگەی



هاوچەرخدا بەو واتایە دێ کە پێویستە لەسەر دادوەران و دادگاکان رۆڵێکی داهێنەرانە بگێڕن کە زۆر دوورە لەو رۆڵەی وەکو کەرەستەیەکی دۆگمای هۆشیاری قانوونیی گەلان دەیگێڕن.

ئەمە ئەگەر گریمان کە حاڵەتێکی زەینی بە کۆمەڵی ئاوا رەنگە هەبێ، سەرباری ئەمە دەبێ بزانین کە قانوونی عورفی لە زۆربەی وڵاتانی کۆمۆنوێڵسدا بەسەر گەلان و کۆمەڵانی عورفی زۆر لێکجیا پراکتیزە کرا، بە هەمان شێوەیەش ئەو قانوونیە مەدەنییەی کەوا لە قانوونی رۆمانی وەرگیراوە، کە ئێستا لە بەشی هەرە زۆری کیشوەری ئەوروپا و وڵاتانی دیکەی دونیا بڵاوبۆتەوە و سەرکەوتووانە خۆی گونجاندووە لەگەڵ پێداویستییە نەتەوەییە جیاوازەکان هەر لە ژاپۆنەوە بگرە تا تورکیا و چەندین وڵاتی ئەفریقا کە لە ئیمپراتۆرییەتی فەرەنسا داماڵان.

## خوێندنگەی مێژوویی بەریتانیا

خوێندنگەی مێژوویی بەریتانیا پێشکەوتنێکی گەورەی بەدیهێنا چونکە ئەو قانوونیە عورفییەی (قانوونی گشتی) کەوا لە بەریتانیادا کاری پێدەکرێ نموونەیەکی هاوچەرخ پێشکەش دەکا کە دیرۆکییەکان حەز دەکەن لە جیهانی قانوونی تازەدا بیدۆزنەوە، چاکەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵە پێشەنگانەی سێر (هێنری مین) کەوا بیرۆکەی پێشکەوتنی "داروین"ی لە جێگەی بیرۆکەی نارۆشەنی گەلدا بەکارهێناو لە "هێربێرت سپێنسەر"یش بیرۆکەی گواستنەوەی لە کۆمەڵگەیەکی دۆگماوە بەرەو کۆمەڵگایەکی ئازادیخواز کە پەیوەندییەکانی لەسەر بنەما گرێبەستییەکان دامەزراندووە، خواست و بەدیاریشی خست کە کۆمەڵگەی پێشکەتوو پێویستی بە گونجاندنی قانوونی خۆی هەیە تاوەکو هاوڕەوتی پێداویستییە کۆمەڵاتییە نوێکان بێ. (هێنری مین) جەختی لەسەر بەردەوامی

پێشکەوتنی مێژوویی کردەوە لە کۆمەڵگەی بەراییەوە یاخود لە عورفی دێرینەوە بەرەو سیستەمە تازەو ئاڵۆزەکان، هاوکات جەختی لەسەر ئەو هۆکارانە کردەوە کە قانوون لە سەردەمە بەراییەکاندا سوودی لێوەرگرتوون لە پێناو گونجان لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی بەردەوام لە پێشکەوتن و گۆڕاندا، لە ڕێگەی گریمان و وێناکردنە قانوونییەکان و دەربازبوون لە بەشێکی گەورەی ئەو دڵڕەقی و دۆگماییەی بەسەریاندا زاڵبوون بە هۆی پرەنسیپەکانی دادەوە، لەو ڕووەوە دووپاتی کردەوە کە دەشێ لە سەردەمەکانی بەرایی بگەین تەنها لە ڕێگەی زمانی تایبەتیان و ناوەڕۆکی مێژووییان، لە هەمانکاتیشدا بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی (ساڤینی) دووپاتی کردەوە کە قانووندانان و بە قانوونکردن، بە تەنها هەردووکیان دەتوانن گەرەنتی چارەسەرکردنی کێشە قانوونییەکان بکەن لە دەوڵەتی تازەداو (هێنری مین) وتەیەکی بە کەڵە زانایانی قانوونی وەکو "مێلاند" و "پۆلۆك" پێشکەش کرد کە دەڵێ:

ئەگەرچی مێژوو تێگەیشتنمان زیاتر دەکا لەمەڕ دۆخی رابردوو و ئێستای قانوون، هەرچەندە کە ناشتوانین ئەو ماوەیە پشتگوێ بخەین کە دۆخی ئێستا لە رووی مێژووییەوە خۆی تێدا دەگونجێنێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەبێ مێژوو وەکو کۆتێك بەکاربهێنرێ بۆ سەپاندنی داب و نەریت و عورفەکان بەسەر پێداویستییەکانی چاخێکی نوێ.



# قانوونی سروشتی و مافە سروشتییەکان

مێژوویێکی درێژ و پڕ گۆڕانکاری بە سەر ئایدیای ئەم دوو قانوونیەدا هاتووە، کە یەکێکیان بە تەنێ پشت بە دەسەڵاتی مرۆڤ دەبەستێ و ئەویدیکەیان خۆی وا دەناسێنێ کە بنەچەیەکی یەزدانی، یان سروشتی هەیەو خۆی لەسەرووی قانوون مرۆڤکردەکاندا دەبینێتەوە، سەرەرای ئەو مێژووە درێژە کەچی لە سەدەی بیستەمیشدا هێشتا ئەم ئایدیایە زیندووە. راستە دەتوانین بڵێین ئەو پێشکەوتنە زانستی و تەکنەلۆجییەی لەسەدەی نۆزدەو لە ئێستادا لە سەرهەڵدانی قوتابخانەی پۆزەتیڤیزم و رەتکردنەوەی ئایدیای قانوونی سروشتیدا رۆڵێکی بنەڕەتیان گێڕاوە، بەڵام ئەو پشێویی و شۆڕش و شەڕو کارە وەحشیگەرییانەی لە مێژووی هاوچەرخدا روویانداوە، زۆر هەنە کە بەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجیایەی دەبەستنەوە کە خزمەتی بە ئامانجی زۆرداران کردووە بە هەمان شێوەش _ گەر نەڵێین زیاتریش _ خزمەتی بە خۆشی و ئاسودەیی و پێشڤەچوونی مرۆڤیش کردووەو ئایدیای قانوونی سروشتی لەبیرو زەیندا زیندوو کردۆتەوە.

هەربۆیە ئامانج لەم بەشە ئەوەیە کە بە کورتی بایەخی ئایدیای قانوونی سروشتی لە رابردوودا بخەینە بەر توێژینەوەو، ئەو شێوانەشی پوخت بکەینەوە کە هەنووکە تیایدا بەرجەستە دەبن، هەروەها ئەو بەشداریکردنەش هەڵبسەنگێنین کە ئەو ئایدیایە دەشێت بۆ ئاریشی قانوون لە جیهانی هاوچەرخدا پێشکەشی بکات.

## مانای سروشت

نە لە کۆمەڵگەی دێرین و کەونارادا و نە لە شێوە سەرەتاییەکانی شارنشینیدا هیچ جیاوازییەکی خویا لەنێوان جیهانی سروشتی و جیهانی مرۆڤ و کاروباری مرۆڤایەتیدا نەدەکرا، بەڵکو پێیانوابوو یەزدان و رۆحگەلی بان- سروشت، ئەو هێزو دەسەڵاتانە ئاراستە دەکەن، یان هەرخۆیانن، کە هەموو شتەکانی گەردوون بە خودی مرۆڤیشەوە بەڕێوە دەبەن و لەسەر زەمین کارو بارەکانی بەڕێدەکەن، لە نێوان ئەو قانوون سروشتی و فیزیکییانەشدا هیچ جۆرە جیاوازییەکی نەکردووە کە سیستمی گەردوون و فەرمانەکانی خواوەندان، یان نوێنەرانی ئەوان لەسەر زەمین بەڕێوەدەبەن کە لە کۆمەڵگەی مرۆییدا بڕیار لە سیستم دەدەن، خواوەندو رۆحگەلی بان-سروشت بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستن و هێزو دەسەڵاتیشیان هەیە کە رێڕەوی ئاسایی و سروشتی شتەکان بوەستێنن، یان بیانگۆڕن، یاخود شەو بکەنە رۆژ و رێڕەوی هەسارە ئاسمانییەکان بەلایەکی دیکەدا ببەن، هەروەها دەست لە کاروباری مرۆڤیشدا دەست وەربدەن و دەرەنجامی شەڕەکان بگۆڕن و ئیمپراتۆریا و گەل و دەسەڵاتداران تەفروتونا بکەن، یان میللەتێك ببوژێننەوەو یەکێکی تریان سوك و ریسوا بکەن، یان تاکەکەس و گەڵان بخەنە بەر توڕەیی یەزدانی خۆیان، یان بکوژن و ببڕن و مردووش زیندوو بکەنەوە.

تا ئەم ئاستەی بیرکردنەوە، هێندەی بتوانین بۆ دەستەواژە تەکنیکییە نوێیەکان وەربیگێڕین، دەکرێت بڵێین سروشت بە شتە سەرووسروشتییەکان بەراورد کراوەو، واش بەراورد کراوە کە سروشت لە شتە سەروو سروشتییەکانیش نزمترە، هەربۆیە بەردەوام دەکەوێتە ژێر فەرمان و دەسەڵاتە نا سەقامگیرەکەی ئەوەوە، کەواتە گەر سروشتی خۆر وەهابێت کە بەشێوەیەك لە شێوەکان هەڵدێت و دەسووڕێتەوە، بەڵام خواوەند دەتوانێت ئەو سیستمە سەرەو ژێر بکات و فەرمان بە رۆژ بدات لەپێناوی ئامانجێکی دیاریکراودا رۆژ بوەستێت و نەجوولێت، ئەم دەستێوەردانەش ئەوکاتە



روویدا کە یەشوع شەڕی (عەمورییەکان)ی دەکرد، سروشت لە باشترین حاڵەتیدا، ئەوحاڵەتەیە کە چاوەڕێ دەکەیت شتەکان و مرۆڤەکان بیگرنە بەر، بەڵام کاتێك لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکاندا گریمانەی ئەوە هەبوو، هێزە میتافیزیکییەکان تەدەخوول بکەن-، ئەوکات پێویستە بۆ روونکردنەوەی ئاراستەو رێڕەوی راستی رووداوە خوایی و مرۆڤییەکانیش تەماشای یەزدان و هێزە میتافیزیکەکان بکەین.

ئەوانەی ئەم مەسەلەیەیان بەشێوەیەکی جیاوازتر لەمە تاوتوێ کردووە کەمن، تەنانەت (چین)یەکانیش، هەرچەندە کە خودان پێشکەوتنێکی رۆشنبیری و شارستانێتییەکی گەشەکردووی چەندین سەدەن، هەرنەگەیشتنە ئەو ئایدیایەی کە باوەڕی بەو کۆمەڵە قانوون سروشتییە جێگیرە هەبێت کە گەردوون بەڕێوەببەن، چینییەکان ئەو ئایدیایەیان پێ قەبووڵ نەکرا کە تاکەکەسێکی قانووندانەری پیرۆز توانای وەی هەبێت بۆ گەردوون و مرۆڤەکان قانوون دابنێت، بەڵکە ئەوان وەك پرەنسیپێکی باڵادەست پێیان لەسەر ئایدیای (گونجان) داگرت، ئەو گونجانەش لە جیهانی سروشتی و مرۆیدا لە رێگەی قانوونی سروشتی، یان قانوونی مرۆڤکردەوە ناتوانرێت بەدیبهێنرێت، بەڵکو لە دوو رێگەوە بەرهەم دەهێنرێت، یان یەکسەر و لە خۆوە، یان لەرێگەی مامەڵەکردن لەگەڵ بارێکی تایبەتەوە بەپێی بارودۆخی ئەو بارە تایبەتە، بەوجۆرە کۆمەڵە قانوونیەك نییە پێش وەختە لە جیهانێکیترەوە دانرابێت، بەڵام گەر هاتوو هەندێك سروت و رێورەسم و نەریتی گونجاو پەیڕەوی لێکرا ئەوا دەشێن گونجان و دادخواهی بپارێزین، بەم هۆیەوەیە دەوترێت چینییەکان نەیانتوانی وەکو خۆرئاواییەکان ئەو گۆشە نیگا زانستییە گەشە پێبدەن کە پێش وەختە گریمانەی ئەوە دادەنێت کە ئەو قانوونیانە قەبووڵ بکات، کە پێشوەختە سەپێنراون و پاساویان بۆ هێنراوەتەوەو شیکراویشنەتەوە.

نموونە چینییەکە واتای ئەوە دەدات کە ئەو ئایدیایەی وا تەماشای ویستی یەزدان دەکات کە هێزێکی میتافیزیکی — لەسەروو سروشتەوەیە- هەمیشە گۆڕاوو

ناجێگیره، حەزی لێیە لە بەرانبەر هێزە بان- سروشتەکاندا باری سروشت لاواز بکات، هەروەها پەیوەندی نێوان ویستی یەزدان و سروشت لە هەندێك باردا وا دەکات سروشت لە بنکەدا دابنرێت، دەکرێت ئەو پێشکەوتنە بەو توندگیرییەوە پەیوەست بکەینەوە کە لە ئاینەکانی جوولەکایەتی و مەسیحیدا لەسەر تاکو تەنیایی خوا دەکرێت، چونکە دوورخستنەوەی ئایدیای فرەخوایی لەوەدا یارمەتیدەر بوو کە توانرا خۆ لە دەستێوەردانی ناجێگیری یەزدانەکان رزگاربکرێت و دەست بە ئایدیای (نموونە — ئایدیالی)ەوە بگیرێت، یاخود مەبەستی یەزدانی کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هێواش هێواش و پلە بەپلە وەلاوە نرا، هەرئەوەش بووە هاندەر بۆ باوەڕهێنان بە سیستمی سروشتی شتە پیرۆزەکان و ئەو فەرمانانەی لەلای خواوە دەرچوون و لەسەر مرۆڤ سەپێنراون، بەوجۆرە دەکارین وا حساب بۆ خوا بکەین کە ئەو قانووندانەرە ئاسمانییەیە کە لەلایەك بۆ هەمیشەو تا ئەبەد سیستمێکی جێگیری بۆ گەردوونی سروشتی داناوەو لە لایەکی دیکەشەوە بۆ رێکخستنی کاروباری خەڵکیش قانوونیەکی بەخشیوە، راستە هێشتا بوارێك ماوە تا جار ناجارێك دەستێوەردانی یەزدانی رووبدات، لێ ئەو دەستێوەردانە ئەفسانەییە کە رووداني دووبارە دەبێتەوە دەکرێت وا مامەڵەی لەتەکدا بکرێت کە شتێکی ریزپەڕێنەو ئامانجی ئەوە نییە لە سیستمی یەزدانیدا، یان لە سیستمی گەردوونیدا دەسوەربدات، بەڵکو مەبەستێتی ئەو سیستمە پتەوترو قایمتر بکات و پشتی ئەو سیستمە بگرێت.

ئەم چارەسەرە نوێیە دەرەنجامی گرنگی هەبوو، وایکرد چارەسەرکردنی زانستیانەی قانوون بەو ئیعتیبارەی پرەنسیپێکی جێگیرە کە جیهانی سروشتی بەڕێوە دەبات، کارێکی کردەنی بێت، گەرچی مەسەلەی بنەچەی ئەم قانوونیانە وەکو مەسەلەیەکی سەربەخۆ لە بوون و کارکردندا لە کاتێکی زۆر درەنگدا نەبێت چارەسەر نەکرا، بەوجۆرە لە زانست و لاهووت جیاکرایەوە و، سروشت وەك سیستمێکی جێگیر کە



مادام لای خواوەیە رێزێکی هەیە لە ریزی پێشەوە دانرا، هەروەها هێڵێکی ئاشکراش نەکێشرا کە ئەم دووشتە جیابکاتەوە، کە یەکێکیان ئەو شتانەیە لە گەردووندا قابیلی گۆڕان نین، چونکە لەلای خواوەیە وەکو سوڕانەوەی زەوی و ئەستێرەکان بە دەوری خۆردا و شوێنی جێگیری ئەستێرەکان، دووەمیشیان ئەو ئاکارانەی مرۆڤە بەو پێیەی قانوونی خوداوەندەو بۆ هەتاهەتایی بەسەر مرۆڤدا سەپێنراوە.

## فەیلەسووفە دێرینەکانی یۆنان

ئەو فەیلەسوفانەی بە (فەیلەسووفانی پاش سوکرات)ناسراون، بۆ تاوتوێکردنی زانستیانەی سروشت، سەرچاوەیەکی بەپیت بوون، هەرچەندە هەندێکیان بە چەمکگەلی لاهووتی و رۆحانێتەوە کاریگەر بوون، لێ ئامانجی سەرەکییان رۆچوون بوو بۆ قوڵایی جیهانی سروشتی تا لەو رێگەیەوە هەندێك لەو پرەنسیپانە بدۆزنەوە کە لەیەککاتدا گەردوون بەڕێوە دەبات و بونیادو کارکردنەکانیشی روون دەکاتەوە، ئەو بەدووگەڕانەیە ئێمە هەندێ جار ناوی لێدەنێین تێڕامانی زانستییانەو جاری دیکەش هەیە بە توێژینەوەی زانستییانە ناوزەدی دەکەین، بەڵام تایبەمەندێتی دەگمەنانەی ئەو فەیلەسووفانە لەوەدایە پشتیان بەو سروتە نەبەستووە کە هزریان رێبەری دەکات، بەڵکو بروایان بە هێزی عەقڵیی مرۆڤ هێناوە کە بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی راستەقینەی جیهان راوێژ بە تێبینییەکان دەکات و گوێ لە تێبینییەکان دەگرێت، لەوێوە بڕواهێنان بە عەقڵانیەت سەریهەڵدا، واتە گەردوون، قانوون مەنتقی و عەقڵییەکان ئاراستەی دەکەن، ئەوانەی عەقڵی مرۆڤانە تێیاندەگات و وەریاندەگرێت و پێی هەرس دەکرێت، ئەوەشە لەسەر زانست و فەلسەفەی خۆرئاوا کاریگەرییەکی زۆری هەیە، لەسەروو ئەوانەشەوە ئەم چارەسەرکردنە سەبارەت بە شوێنگەی مرۆڤ لە جیهاندا دەرەنجامی گرنگی هەیە،

هەتا لە گۆشەنیگایەکی عەقڵانییەوە لە گەردوون بڕوانین و وا تەماشا بکەین عەقڵی مرۆڤ لەو بە عەقڵانی کردنەدا بەشدار بووبێت، ئەوا دەکارێت ئەو پرەنسیپە عەقڵانییانە دەستنیشان بکەین، کە ئاکاری مرۆڤی تاکەکەس و تاك و کۆمەڵێش ئاراستە دەکەن.

ئەم رەوتە گریکییەی کە بۆ گەڕان بەدووی قەوارەی جیهاندا لە توێژینەوەدا دەیانگرتەبەر کە تیایدا بەتەنێ پێوانەی سروشتیان بەکاردەهێنا، خەرمانەیەکی تایبەتیان بەدەوری ئەو سیستمەدا دەنەخشان کە بە شتە سروشتییەکانی هەردوو بواری سروشتی و مرۆڤییەوە تایبەت بوو، تا وایلێهات هەموو شتە سروشتییەکان بوونە وێنەیەك بۆ هەموو شتە راست و رەوانەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئەو شرۆڤەکردنە لەسەر ئاکاری مرۆیانە جێبەجێ کرا، دەستەبەجێ ئاریشە و زەحمەتی سەریان هەڵدا، چونکە کاتێك جەستەو تەنە سروشتییەکان دەپشکنرێن، ئاسایی دەکرێت بزانین ئەو قانوون سروشتییە چییە کە بەکردەنی دەبێت ملکەچی ببن، یان ملکەچی بوون، بەڵام دەپرسین ئایا بۆ خودی مرۆڤ خۆی (سروشتی) چییە؟ بۆ نموونە دەکرێت بووترێت سروشت توانای بەهێزەکانە بۆ زاڵ بوون بەسەر لاوازەکاندا، بەڵام ئایا ئەوەی یەکەمیان (واتە بەهێزەکە) بەسەر دووەمدا (لاوازەکەدا) دەیسەپێنێ، ئایا ئەوەیە کە بڕیارلەوە دەدات کە چ شتێك بۆ مرۆڤ گونجاوە؟ یاخود دەوترێت هەوڵی هەموو مرۆڤێك بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو برا مرۆڤەی کە لەو لاوازترە، تەنیا یەك دەرەنجامی هەیە کە ئەویش (بێسەرووبەرییە_فەوزایە)، هەربۆیە ئەوەی سروشت دەیخوازێت بۆ مانەوەی خود ئەوەیە کە مرۆڤ دەست لە هێزی خۆی هەڵبگرێت تا زیان بە دراوسێکەی نەگەیەنێت، قانوونەکانیش، لاوازەکان لە زەبری بەهێزەکان بپارێزن، لەوێدا دەتوانین بڵێین بنەمایەك نییە بۆ مرۆڤەکان سروشتی بێت و ئاکارو هەڵسوکەوتیان ئاراستە بکات، ئەوەش بەو هۆیەوەیە کە ئەو ئاکارانە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێن، لێرەوەیە دەکارێت بڵێین قانوونەکان هیچ نین



تەنیا رێکخستنێکی کلاسیکی نەبێت، شتێکی سروشتیش نییە ئەو شتانە دەست نیشان بکات کە پێویستە لەناو قانوونەکاندا هەبن، لە مرۆڤەکانیشدا سروشت جگە لە غەریزەیەك هیچی دی نییە، زۆر لە قانوون مرۆڤکردەکانیش هەوڵی خامۆشکردن و سنووردارکردنی غەریزەکانی مرۆڤ دەدەن بەتایبەتی غەریزەی سێکس.

ئەم بۆچوونەو بیروبۆچوونی تری لەو چەشنە بوونەتە بەشێك لەو چەندوچوونانەی کە لە سەدەی پێنجەمی بەر لە زاین لە یۆناندا باویان هەبووە، بەڵام دوو فەیلەسوفی یۆنانی تر ئەرستۆو ئەفلاتون توانیان وەرچەرخانێکی نوێ بۆ ئەو چەندووچوونە دروست بکەن.

## ئەفلاتون و ئەرستۆ

ئەفلاتون بەپێی فەلسەفە (ئایدیالیەکەی - میسالییەکە)ی وەڵامی ئەو پرسگەلەی دایەوە، ئەو پێی وایە ئەزموونە راستەوخۆکانی هەستەکانی ئێمە جگە لە جیهانێك لە سێبەرو، وێنەدانەوەیەکی کاڵی راستییەکان نەبێت، هیچی تر نین، ئەوانەی لە بواری داماڵراوەکاندان و کەوتووونەتە پشتی مەودای (ئینتیباعاتی) ئێستای هەستەکانمانەوە، ئەم فەلسەفە تەمومژاوییە بەو بیروبارووەڕە یۆنانییەوە پەیوەست بوو کە سەبارەت بە هێزی عەقڵانێت هەبوو، چونکە ئەفلاتون بڕوای بەوە هەبوو پیاوێکی حەکیمی رۆشنبیر بە فەلسەفە(کە فەلسەفەکەی ئەو بوو)دەتوانێت بۆ ئەو جیهانە کاملەی لە پشتی جیهانی هەستەکانماوەن تێڕوانێك بەدیبهێنێت.

ئەم چارەسەرکردنە ئایدیالییەی وەك (ئایدیایەك —فکرەیەك) دانرا جۆرێك لە شتێکی خودێتی داماڵراو بوو، زیاتر لەوەی تەنیا روخسارێکی فیزیاییانەی جیهانی راستەوخۆ بێت، ئەفلاتون بەیەکەوە لەسەر جیهانی ئاکارو لەسەر دیاردەی فیزیایی پیادەی کرد، لە راستیشدا ئەو کتێبە بەناوبانگەی کە بەناوی (کۆمار)ە بۆ ئەوە داینابوو کە ئایدیای (داد )ی تیا شرۆڤە بکات، تیایدا وا (دادپەروەر)یشی

خستبووە روو کە جۆرە داماڵراوێکە لەلایەن فەیلەسوفەوە نەبێت تێگەیشتن لێی روونادات، بەدیهێنانیشی روونادات لە سەر دەستی دەوڵەتێکی ئایدیالیستیەوە نەبێت، کە فەرمانڕەواکانی دەبێت پادشایەکی فەیلەسووف بن، داد وەك زۆر لە قانوونی دەوڵەتەکان دەیخەنە روو لە باشترین باریدا تەنیا سێبەرێکی کاڵی دادی راستەقینەیە، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەفلاتون زۆر لە سوکراتی مامۆستایەوە دووردەکەوێتەوە لەوەدا کە سوکرات رێزێکی زۆری لە قانوون نیشتیمانییەکان دەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەفلاتون باوەڕی بەوە نەبوو دادوەری باڵا ئەو شێوە قانوونییەیە کە سروشت دایناوەو، قانوونی مرۆڤکردیش لە بارێکدایە کە بۆتە پاشکۆی ئەو، راستە _ پاش ئەوەی پیربوو_ ئەفلاتون لەو کتێبەیدا کە بەناوی (قانوونەکان) هەوڵیدا روونی بکاتەوە چۆن دادی ئایدیالی دەکرێت بەو قانوونیانە بەدیبهێنرێت کە دەوڵەتێکی زیندوو بەرێوە دەبەن، بەلام توخنی ئەو رێگایانە نەکەوت کە دەسەلاتی قانوون کۆنەکان رێکبخات لەرێگەی کۆمەڵێك قانوونی ئایدیالییەوە کە وەك گشتێك تەماشا کرابێت، هەروەها گۆشەنیگای چەقبەستووانەی ئەفلاتون بۆ داد- وەکو گۆشەنیگا تۆباوییەکانی تر- بۆ قانوون و حکوومەت خودان چەمکێکی تۆتالیتاریانەیە لە توندترین و رەقترین شێوەو جۆرەکانیدا.

هەرچی ئەرستۆیە کاروانی خۆی وەك قوتابییەکی ئەفلاتون دەست پێکرد، بەلام دواتر هێواش هێواش فەلسەفە ئایدیالیستییەکەی مامۆستاکەی رەتکردەوە، ئەرستۆ هەرچەندە بایەخی بە لاهوت دەدا، بەلام هەوڵەکانیشی دیاربوو بۆ ئەوەی جیهانی مەعریفە لە رێگەی چەمکێکی زانستیانەی واوە گەشەپێبدات کە پشتی بە تێبینی و ئەزموون بەستووە، وەك (سروشتخواهێك)، بەرانبەر بە سروشت فکرەیەکی (دینامیکییانە) جوولاوانەی لا دروست بوو، بەوەی سروشت توانایەکە بۆ گەشەکردن کە لە هەناوی شتە تایبەتەکاندایە، ئەم شرۆڤەکردنەشی بەپێی چەمکی مەبەست، یان مەبەست لە شتەکان چییەیە؟، لەوەدا ئەمیش هەروەك ئەفلاتون



هەردوو دیاردەی خۆڵقێندراوەکان و جیهانی فیزیایی بەیەکەوە چارەسەرکرد، ئەرستۆ دانی بەوەدا نا کە دەکرێت داد لە جیهانی مرۆڤەکاندا کلاسیکی بێت، بەپێی مێژووی هەر کۆمەڵگەیەك و پێداویستییەکانی لە دەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت، هەروەها دەکرێت داد سروشتی بێت ئەوەش تەواوی نەژادی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، چونکە پشت بە مەبەستێکی بنەڕەتییانەی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی سیاسی و جڤاکی دەبەستێت، ئەرستۆ لەو بوارەدا زۆر فراوان و قووڵ نابێتەوە، هەرچەندە دان بە راستییەکی گرنگدا دەنێت ئەویش بریتییە لەوەی گەر هاتوو لای یەزدان هیچ شتێك گۆڕانی بەسەردا نەیەت، ئەوا لای مرۆڤ هەموو شتەکان هی ئەوەن گۆڕانیان بەسەردا بێت، لەناو ئەو شتانەشدا دادی سروشتیش.

لەوێدا دژبەیەکییەك لەنێوان هەڵوێستەکانی ئەرستۆو ئەفلاتوندا دەردەکەوێت کە تا بەمرۆش دەگات لەسەر ئایدیای قانوونی سروشتیدا کاریگەری خۆی ماوە، ئایدیای دادی سروشتی، یان قانوونی سروشتی، بەگشتی وەکو چەمك لەبەرانبەر ((سروشت))دا دوو رێڕەوی دژبەیەکیان دەگرێتەبەر، لەلایەك دەکرێت سروشت گوزارشێکی ئایدیالیستیانە بێت بۆ ئاوات و ئامانجە سەرەکییەکانی مرۆڤ لەوکاتەدا کە هەموو هێزە شاراوەکانی بەدیدێت، لەلایەکی ترەوە دەکرێت سروشت وا حساب بکرێت کە ئەو رێگایەیە کە مرۆڤ بە هۆی پێکهاتە سایکۆلۆژییە — فیزیاییەکەی - خۆیەوە دەیگرێتەبەر، بەپێی چەمکی یەکەمیان بێت سروشت پێوانەیەکی ئایدیالیستیانەیە ئەو کارو شتانەی پێدەپێورێت کە پووخت ناسروشتی و ناکلاسیکیین، بەلام سروشت لای چەمکی دوەمییان کارێکی واقعی راستەقینەیە چونکە پشت بەو جۆرە دیراسەکردنەی مرۆڤ دەبەستێت کە تەماشای مرۆڤ دەکات وەك ئەوەی کە هەیە، نەك وەك ئەوەی لە رووی هێزو توانایەوە خۆزگە دەبرێت کە بۆ ئاستێکی ئایدیالیستی بەرزبکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چەمکەی دووەمیان لە ناوەخنەوە رەگەزێکی پێوانەکاریانەی لە خۆگرتووە، چونکە لە رێگەی پشکنینی

ئاکاری کردەنیانەی مرۆڤەوەو بۆ جیاکردنەوەی ئەوەی سروشتییەو ئەوەی ناسروشتییە بەلای مرۆڤەوە پێویستە پێوانەیەك بەکاربهێنرێت، لەو پێناوەدا پێویستە پێوانەی جیاواز لە چەشنی تەندروستی و پێکهاتەی سایکۆلۆژی و جەستەیی باش، یان باری کۆمەڵایەتی و گونجاوێتی کۆمەڵایەتی، یان خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی، بەکاربهێنین، گەر زانیشمان ئەو چەمکانە هەموویان چەندین بەهایان لە هەموو رەگەزەکانەوە لە خۆگرتووە، هەربۆیە لە رووی سیفەتەوە و لە جەوهەریشیدا پێوانەییە.

سەبارەت بە دەرکردنی جەوهەری قانوونی سروشتی هێشتا ناکۆکی مەزن هەیە، ناکۆکییەکە لە نێوان ئەم دوو چارەسەرکردنانەدایە، یەکەمیان کە قانوونی سروشتی وەك پێوانەیەکی ئایدیالیانە دەزانێت کە دەکرێت لە رێگەی شرۆڤەو ئیلهام و درکپێکردن و بەڵگەو سەلماندن و شتی لەو چەشنەوە، هەڵبهێنجێنرێت، دووەمیشیان ئەو چارەسەرییە راسەقینەیەیە کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئاکارو رەفتاری مرۆڤەوە دەرەچێت، بە چارەسەری کۆتایش دادەنرێت، باشترین بەڵگە بۆ دەرخستنی سروشتی بوونی فەرمانەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا ئەو قانوونو پێوانەن کە لای هەموو رەگەزێکی مرۆڤی و لە هەموو جۆرەکانی کۆمەڵگەکانیان بە شتێکی گشتی دادەنرێن، جاگەر هاتوو یەکی سروشتی لەو جۆرە بینرایەوە، دەکرێت ئەو بەڵگە گرنگانەش بەدەست بخەین تا بتوانین سەبارەت بە مرۆیی بوونیان و زانینی ناوەخنەکانیان لێکۆڵینەوەی بەراوردکارییانە بەئەنجام بگەیەنین، لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەك ئەفلاتونیش پێی وایە، گۆشەنیگای پێشتر بەرەو ئەوە چوو، بۆ قانوونی سروشتی گۆشەنیگایەکی تەواو ئایدیالیستیانەی هەبێت، بەو پێیەی ئەوە شتێکە دەکرێت لەرێگەی دەرك پێکردنی عەقڵییەوە بەدی بکەین، بەڵام ئەوە شتێکە پێشتر بەدینەهێنراو لە سەر ئەم زەمینەشدا شتێکە بەدیهێنانی لە داهاتووشدا (مومکین) نییە، دەبینین چەمکە نوێیەکانیش سەبارەت بە قانوونی



سروشتی لە نێوان ئەم دوو چەمکە جیاوازانەدا چەقیان بەستووە، ئەم دوو چەمکەی کە یەکێکیان وەك راستییەکی واقع تەماشای دەکات و ئەویتریان وەك ئایدیایەکی ئایدیالیستیانەی وا کە هەوڵێدا لە هەردوو چارەسەرکردنەکەدا پشتیوانی بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، لە راستیشدا لە رێگەی هزری ئەرستۆوە و سەبارەت بە بەرقەرارکردنی دادی سروشتی لەسەر ئەو قانوون هاوبەشانەی رەگەزی مرۆڤ هەیانە، نیشانەی تەمتوومانی دەبینین لەسەر ئەم دوو چەمکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایدیالیستیشە هێندەی واتە ماشای بکرێت کە بەلای مرۆڤە و سروشتییە لەو رووەوەی کە رێ بۆ مرۆڤ خۆش دەکات وەك بوونەوەرێکی جڤاکیانە ئامانجەکانی بەدیبهێنێت.

## فەلسەفەی رواقییەکان

هەموو مێژووی دواتری قانوونی سروشتی زۆر قەرزارباری فەلسەفەی رواقییەکانە کە پاشی ئەرستۆ بەدەرکەوت، هەرچەندە ئەرستۆ پێیوابوو دادی سروشتی شتێکی گشتییەو بۆ هەموو خەڵکە، بەڵام چەمکی وی بۆ دادی ئایدیالیستیانە، وەك چەمکەکەی ئەفلاتون، بە ئایدیای ئەو دەوڵەتە یۆنانییەوە پەیوەست بوو کە رێژەییانە دەوڵەتی بچووك بوون، گەرچی بە پێوانەیەکی گەردوونیانە دەکرێت بڵێین ئەرستۆ زۆر دوور بوو لەوەی بیرلە قانوونیەك بکاتەوە، کە بە پشت بەستن بە سیفەتی هاوبەشانەی نێوانیان، هەموو مرۆڤەکان وەك یەك ببات بەرێوە، تەنانەت ئەرستۆ بیانووی بۆ سیستمی کۆیلایەتی هێناوەتەوەو بە سیستمێکی سروشتی داناوە بەو پێیەی هەندێك مرۆڤ هەنە بەسروشتی خۆیان بە کۆیلەیەتی خوڵقاون، بەپێی بواریش دادی سروشتی بەسەر یۆنانییە ئازادەکاندا جێبەجێ دەکرا نەك لەسەر کۆیلەکان، یان لەسەر(بەرابرەکان-البرارە)، کاتێکیش بەهۆی هەڵمەتەکانی

ئەسکەندەری مەزنەوە (دەوڵەتە شار)ی یۆنانی بەڵاداهات، گۆشەنیگایەکی نوێ بەسەر فەلسەفەی یۆنانیدا زاڵ بوو، دوو مەزهەب، یان دوو قوتابخانە دەرکەوتن، (ئەبیقوری)و (رواقی)، قوتابخانەی یەکەمیان لەگەڵ قوتابخانەی پۆزەتیڤیزمی کەڵکداریدا- الوضعي النفعي_يدا، چەندین تایبەتمەندێتی هاوبەشیان هەیە، هەرچی قوتابخانەی رواقییەکانە پێی لەسەر جیهانێتی سروشتی مرۆڤی و برایەتی مرۆڤەکان دادەگرت، یەکێك لە تایبەتمەندییە دیارەکانی ئەم قوتابخانەیە سووربوونێتی لەسەر عەقڵ بەو پێیەی تایبەتمەندییەکی بنەڕەتی مرۆڤایەتییە، کاتێکیش قوتابخانەیەکی قانوونی لە مەزهەبی رواقی واتە قانوونی شار(پولیس) و قانوونی شاری گەردوونی(کۆسمۆپولیس)ی بڵاوبۆوە، قانوونی شاری گەردوونی وا حسابی بۆکرا کە قانوونیەکی عەقڵانییە، نەك هەرئەوە بەڵکو خودانی بڵندێتییەکی بنەڕەتی بوو بەسەر قانوون لۆکاڵییە کلاسیکییەکانەوە، کە حوکمی هەندێك وڵاتی دەکرد، بەو جۆرە دەرەکەوێت بەلای رواقیەکانەوە قانوونیەکی سروشتی جیهانی بوونی هەبووە کە دەکرێت لەرێگەی عەقڵەوە بەدیبهێنرێت و بەهۆیەوە دەکرێت دادپەروەرێتی قانوونی مرۆڤکرد تاقیبکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئاماژەیەك بۆئەوە نییە کە کێشەی نێوان ئەم دوو قانوونیە پێویستە ببێتە هۆی ئەوەی لە بەرژەوەندی قانوونی پێشتر قانوونەکەی ئەم دواییەیان رەت بکرێتەوە، درەنگ هاتنی قوتابخانەی رواقییەکان هاوکات بوو لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی رۆمانییەکان بەسەر جیهانی دەریای سپی ناوەڕاستدا، لەو فراوانبوونەی دەسەڵاتی رۆمانییەکاندا هزرو بیروبۆچوونی رواقییەکان پشکداربوو، ئەو پشکداربوونەش لەوەدا بوو کە هۆی دەرکەوتنی ئەو قانوونیەی رۆمانی کە بە (قانوونی گەلان Jus Gentium ) ناسراوە، قانوونیەك بووە کە بەسەر رۆمانییەکان و بیانییەکانی ناو دەوڵەتی رۆمانیدا جێبەجێ دەکرا، ئایدیای ئەو قانوون گشتییەی کە بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا لانی کەم لە چوارچێوەی جیهانە فراوانەکەی رۆماندا جێبەجێ دەکرا،



سەنتەرێك بوو بۆ مەزهەبی داماڵراوی رواقییەکان لە قانوونی سروشتی جیهانیانە، پارێزەرە رۆمانییەکان بەکەمی نەبێت قانوونی سروشتیان بەکارنەدەهێنا، هەرچەندی گەڕانەوە بۆ ئەو ئایدیایە لە کتێبەکانی فەقیە، یان (قانووندانەرە) رۆمانییەکان و لە وتەی وتاربێژەکانیاندا لە چەشنی ((شیشیرون))دا ئەو ئامرازو کەناڵانە بوون، لێیانەوە ئایدیای قانوونی سروشتی لە چەرخە کۆنەکانەوە بۆ سەردەمی نوێ تێپەڕیوە.

## مەسیحییەت و قانوونی سروشتی

فراوانبوونی باڵادەستێتی ئیمپراتۆتریەتی رۆمانی و ئەو ئاشتەواییەی لەو سەردەمەدا بڵاوبۆوە نەك تەنێ یارمەتیدەر نەبوو بۆ بڵابوونەوەی مەزهەبە گەردوونییەکانی قانوونی سروشتی رواقییەکان و قانوونی گەلان، بەڵکو بۆ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕێکی گەردوونیانەی نوێ بواری رەخساند کەمەسیحییەتە، بەڵێ لە راستیدا لاهوتی مەسیحی کە بناغەکەی لەسەر فەلسەفەی یۆنانی و قانوونی رۆمانییە لە دواییدا تێکەڵ بوو بە مەزهەبی قانوونی سروشتی قوتابخانیانەی چاخەکانی ناوەڕاست و لەسەر ئەوانە دامەزراوە، لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ لە فەلسەفەی قانوون لە خۆرئاوادا رۆڵێکی دیاری هەبووە.

لەگەڵ ئەوەشدا لە چارەسەری مەسیحییەت بۆ قانوون زەحمەتییەکی شاراوەی زۆر هەبوو، ئەوەش بەجۆرێك بوو لەرێگەی پرۆسەیەکی درێژی قورسەوە توانرا بەسەر ئەو زەحمەتییانەدا زاڵێتی بەدەست بێت، گۆشەنیگای یەهودییەت (جوولەکایەتی) بۆ قانوون وەکو بینیمان پێی وابوو قانوون لەسەر زەمین نوێنەرایەتی ویستی یەزدان دەکات، هەرلە سەر ئەو بنچینەیەشە بەلای ئەو گۆشەنیگایەوە شتێکی باشە، هەربۆیە مەسیحییە ئەوەڵەکان رقیان لە شتە دونیاییەکان دەبۆوەو، پێشبینی وێران

بوونی جیهان و دەرکەوتنی مەملەکەتی خودایان دەکرد، لەوێوە بوو پێیان وابوو راستە پێویستە ملکەچی بۆ دەسەڵاتدارە دونیاییەکان کەچ بکرێت تا ئەو کاتەی بە فەرمانێکی یەزدانی رژێمەکەیان لەناودەچێت و هەڵدەگەڕێتەوە، واش تەماشای ئەو قانوونیانەیان دەکرد هیچ نین جگە لە شەڕانگێزی و لە ئەنجامی گوناهەکانی مرۆڤ خۆیەوە بەرهەم هاتوون و هەرلە کەوتنی مرۆڤ خۆیەوە سەرچاوەیان گرتوە، لەوێوە بوو مەسیحییە ئەوەڵەکان بڕوایان بەو پرەنسیپانەی مەزهەبی رواقییەکان هەبوو دەربارەی برایەتی مرۆڤەکان، بەڵام لە هەمبەر ئایدیای بوونی قانوونیەکی گەردوونیانە بۆ عەقڵ لەسەر زەمین، بێ دەربەست بوون، کاریگەرێتیمەسیحییەت لەسەر ئەفلاتونی بەجوانی لە کتێبەکەی قەدیس ئۆگەستین ی بەناوبانگدا دەرەکەوێت کەبەناوی ((شاری خودا))وەیەو لە سەدەی چوارەمی زاینیدا نوسیوێتی، لەوێدا هاوشانێتی کردووە لەنێوان چەمکی ئەفلاتون بۆ دادی نمونەیی و، چەمکی شاری خوداوەند لە سەر زەمین، کە لە دوا ویستگەیدا دادپەروەریمەسیحییەت سەردەکەوێت و ئەوکات بەتەنییا خۆی بڵند دەبێت.

هاوکات لەگەڵ ئەوانەدا نووسەرە مەسیحییەکان دانیان بەوەداناوە کە ئەو دادپەروەرییەی خودا دایناوە شتێکی پێویستە، تەنانەت لەو دەوڵەتانەی جیهانیش کە خودانی سەروەرییەکی کەموکورتن، قەشە ئۆگستین تەنانەت ئاماژەشی بەوە داوە کە((بەبێ داد ئیتر دەوڵەت لە کۆمەڵێك رێگرو چەتە زیاتر هیچی تر نابێت))، دادپەروەرییەکی لەو جۆرەش بەبەشێك لە قانوونی یەزدانی دادەنرێت کە یەزدان بۆ حوکمڕانی کردنی مرۆڤایەتی دایناوە، هەتا ئەو رۆژەی لەسەر زەمین بوونی مرۆڤایەتی دەمێنێ ئەو بوونەی کە پێیان وایە هەڵەیەکە و هیچی تر، بەوهۆیەوە بەشێك لە سیستمی ئاسمانی بۆ شتەکان هەرچەندە شێوەیەکی نزمتری ئەو دادپەروەرییە یەزدانییە وێنا دەکاتەوە، کە لە دواویستگەدا لەشارەکەی خوداوەندا بەرکەماڵ دەبێت، هەموو دەزگا مرۆڤییەکان هەرلە قانوونی خاوەندارێتییەوە تا



سیستمی کۆیلایەتی و ئەوانی تریش، بە هۆی گوناهەکانەوە هەموویان دەزگای هەڵەن، بەڵام ناچارانە بەشێك لەو سیستمە پێکدەهێنن کە بۆ شتەکان پێویستن، هەروەکو لە خوارەوە روون کراوەتەوە، بەوجۆرە قانوونی سروشتی هاوشانی قانوونی یەزدانی دەبێ، کە بەشێکی سروتەکان لە رێگەی موئجیزەوە دابەزین و بەشەکانی تریشی لە رێگەی عەقڵەوە، بەڵام کەموکورتی و خەوش و خاڵە راسەقینەکانی سروشتی مرۆڤ کە بە هۆی گوناهەکانەوە روودەدەن، قانوونیەکی سروشتی وای پێویستە کە زۆر تایبەتمەندێتی دادی نموونەیی تیادا نییە، زۆری نەبرد پەیوەندی نێوان قانوونی سروشتی و لاهوتی مەسیحییەتدا پتەوتربوو، گەر بە قانوون سروشتییە کۆنەکەی رواقییەکانیشەوە بەراورد بکرێت، دەبینین دەسەڵاتەکەشی زۆرتر بوو، چونکە لەوێوە قانوون سروشتییەکە ئیتر لە لای خواوەندەوە سەپێنراوەو لە رێگەی (پاپا)ەوە سەرۆکی کەنیسەی کاسۆلیکیەوە راڤە کراو، ئەویش جێگری یەزدانە و بەو پێیە ئیتر دەسەڵاتی راڤەکردنی قانوونەکانی خوای هەیە ئەو قانوونیانەی بەسەر دەسەڵاتداران و ژێر دەسەڵاتدارانیشەوە وەکو یەك جێبەجێ دەکرێت، بەوجۆرە ئەو ئایدیایە بڵاوبۆوە کەوا قانوونی مرۆڤکرد بۆ قانوونی سروشتی ملکەچەو ئەگەر لەگەڵیشدا کەوتە ململانێوە ئەوا ناشتوانێ بەرگەی قانوونی سروشتی بگرێ و لەبەرانبەریدا خۆی بهێڵێتەوە، لەوێوە ئامرازو دەزگاو ئەو دەسەڵاتە بینرایەوە کە خۆی لە دەسەڵاتی پاپاو قەشە کاسۆلیکەکاندا دەبینییەوە ئەوانەی دەسەڵاتەکەیان هەر هێندە نییە کە قانوونکە بە جۆرێك راڤە بکەن هەموو کەس تێبگات، و رێپێدراوو رێ پێنەدراوەکانی لەیەك جیابکەنەوە، بەڵکو ئەو دەسەڵاتە فراوانتر ببوو تا گەیەشتبووە ئەوەی داوا لە پادشاو ئیمپراتۆرەکان (بەو پێیەی بازووی دونیاییانەی سیستمی رۆحین) بکەن کە دان بەو قانوونیەدا بنێن و فەرمانەکانی خودا بسەپێنن، تا وایلێهات کەنیسە خۆی بتوانێت سزاکان بسەپێنێت و سزای تایبەتی کەنیسەش بۆ خۆی دەسەڵاتی سەپاندنیانی

هەبێت، بەتایبەت سزای زۆر ترسێنەر، کە خۆی لە سزای دەرکردن لە کەنیسە، یان مەحرومکردنی کەسێك لە کەنیسە بوو.

## ئەکوینیی و سکولاستیکی SCHOLASTICISM

لە دوادواییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا رەگەزێکی گرنگ چووە ناو فەلسەفەی کاسۆلیکیەوە کاتێك سەرلەنوێ کتێبەکانی ئەرستۆ خوێنرانەوە(هەرچەندە ئەو پرۆسەیە بەشێوەیەکی شێوێنراوو لە رێگەی تەرجەمەکراوی تێکستە عەرەبییەکانی ئەرستۆوە بوو)، هەروەها لەرێگەی هەولّی دەرخستنی وێناکردنەوەی لەگەڵ لاهوتی مەسیحیدا، لەوێوە ئایدیای سکولاستیکی بەدەرکەوت کە قەشە تۆماس ئەکوینی دیاترین بانگەشەکەرانی بوو، ئەکوینی ئایدیا کۆنەکەی رەتکردەوە کە دەیووت قانوونو حکوومەتەکان لە گوناهباریدا هاوشانی یەکترن و تێگەیشتنی هەردووکیشیان کەموکورتی تیادایە، ئەوەش لەژێر کاریگەری ئەو گۆشەنیگایەی ئەرستۆدا بووە کە بۆ مرۆڤ هەیبووەو لەسەر ئەوە بووە کە مرۆڤ توانای هەیە لە کۆمەڵگەی سیاسیدا گەشەسەندنێکی ئاسایی بەدیبهێنێت، هەربۆیە دەبوا لە نێوان دوو قانووندا بەراورد بکرایە، یەکێکیان قانوون پیرۆزەکەیە، یان قانوونی یەزدانییە کە لە رێگەی سروت و ئیلهامەوە نەبێت نازانرێت، دووەمیشیان قانوونی سروشتییە کە بەتەواوی قانوونیەکی عەقڵییەو دەکرێت لەبەر رۆشنایی عەقڵی مرۆڤیداو بەبێ هیچ یارمەتیدانێکی تر لێی تێبگەین و راڤەی بکەین، بەو شێوەیە فەلسەفەی سکوڵاستیکی[1] فەلسەفەیەکی عەقڵانی بوو لە ئاستێکی بەرزیدا بەو مانایەی کە

---

[1] سکوڵاستیکیە: SCHOLASTICISM فەلسەفەیەکی نەسرانییە لە چاخەکانی ناوەڕاست و سەرەتاکانی سەدەی رێنیسانسدا بەدەرکەوتووە، ئەم فەلسەفەیە لەسەر مەنتقی ئەرستۆو ئەو چەمکانەی بنیات نراوە کە لەسەر میتافیزیکیایە، بەڵام لە ئەورووپای خۆرئاوادا وادەرکەوت کە بۆ



تەواو پشتی بە راستی دەبەست و لە مەنتق و شرۆڤەی واتادارییەوە شتەکانی هەڵدەهێنجا، بەڵام گریمانەکانی لەسەر بنچینەیەکی عەقڵانی هەڵنەدەبژارد بەڵکو لەسەر بنچینەی بەخششەکانی بیروباوەری لاهوتی مەسیحی بوو، بەو جۆرە عەقڵانیەت دەتوانێت ململانێ لەگەڵ راستی و دروستی ئەو دەرەنجامانە بکات کە لەو گریمانانەوە بەدەست کەوتوون، بەڵام ناتوانێت هەمان ئەو گریمانانە ئینکاربکات، زانستیانە، یان هەرتەقیانە، یان ((گومڕایی ئاینی)) بوایە، گرنگ ئەوەبوو لێپرسینەوە ئەو شتە بوو کە هەمیشە بیردەخرایەوە.

ئەکوینی لە چوارچێوەیەکی چالاکانەی تردا بۆ هزری قانوونی سروشی نموونەیەکی نوێی دامەزراند، قانوونی سروشتی ئەو کۆمەڵە بنەمایانە نییە کە تەواوی دەڤەری کاروبارەکانی مرۆڤ دابپۆشێ، بەڵکو لەوێدا زۆر کاری تر هەیە پێویستیان بەوەیە لە رێگەی قانوونوە رێکبخرێن بەڵام هێشتا لە رووی ئاکارییەوە دوورن لەوەی ببنە جێی بایەخپێدان هەروەك چۆن ئەرستۆ روونی کردۆتەوە، قانوونیش باشترین نمونەیە بۆئەوە چونکە ئەوەی گرنگە پێگیربوونە بە لایەنێك لە لایەنەکانی رێگاکەوە، هەربۆیە ئەوەگرنگ نییە لە رووی خولقاوییەوە کام لایەنەی رێگاکە هەڵدەبژێریت، ئەکوینی دانی بەوەدانابوو کە سروشت بەشێوەیەکی رەها چەمکێکی گران نییە، بەڵکو لە قانوونی سروشتیدا چەند بەشێکی دیاریکراو هەیە (کە بە روونی دەستنیشانی نەکردووە)) قابیلی نەمانن، یان بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بارودۆخە گۆڕاوەکاندا دەکرێت بگۆڕدرێن.

بەو جۆرە قانوونی مرۆڤکرد پێگەکەی خۆی بەدەست خستەوە رێگەشی پێدرا لە حکوومەتەکاندا رۆڵێکی کاریگەرانە بگێڕێت و ئەو بۆشاییانەش پڕبکاتەوە کە

---

ملکەچ پێکردنی فەلسەفەیە بۆ لاهووت، تۆما ئەکوینی دیارترین پیاوانی ئەو فەلسەفەیەن ئەو بوو هەولێکی زۆری دا تا لە نێوان عەقڵ و ئاییندا پەیوەندییەکی عەقڵانی دابمەزرێنێت.

قانوونی سروشتی بەجێیانی هێشتبوو، هەروەها ڕێی بۆ خۆش بوو ناوەڕۆکی فەرمانەکانی قانوونی سروشتی لە پەیوەندی خۆی بە چەندین ئالۆزییەکانی پەیوەندییە مرۆڤییەکانەوە چاك بکاتەوە ئەو ئالۆزییانەی قانوونی سروشتی قانوونیەکی ڕاستەوخۆی بۆ دانەنابوون، بەڵکو تەنیا بنەمایەکی ڕێنیشاندەرانەو ئاراستەکەرانەی گشتی بۆ دانابوون، لێ چی بکرێت کاتێك زانرا قانوونی مرۆڤکرد لەگەڵ قانوونی سروشتیدا دژ دەوەستێتەوە، لەو بارەدا قانوونی مرۆڤکرد هەڵدەوەشێنرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بەوەی هاولاتی چی بکات کاتێك دادوەر فەرمانێك، یان قانوونیەکی بەسەردا دەسەپێنێ لەگەڵ قانوونی سروشتیدا پێچەوانەو دژە، لەمەدا ئەکوینی بیروباوەڕەکانی هەر بە تەمومژاویی مانەوە، بەڵام وا دەرەکەوێت ئەکوینی لەوەدا پێی وابوو پێویستە ملکەچی بنوێنرێت بۆ ئەوەی بێسەروبەری و شورەییەکی قانوونی نەخوڵقێت، و بارەکە بۆ خوداوەند بەجێبهێڵرێت تا ئەو بە ڕێگا تایبەتەکانی خۆی یەکلایی بکاتەوە.

## ڕێنیسانس و قانوونی سروشتی عەلمانی

ئەو فەلسەفە مرۆییە نوێیەی لە سەدەی پانزەوە لە ئیتاڵیا بەدەرکەوت بۆ مێژووی هزری قانوونی تۆوێکی گرنگی هەڵگرتبوو، لەو کاتەیدا کەنیسەی کاسۆلیکی خۆی بە فەلسەفەی سکۆلاستیکیەوە بەستبۆوە، لەولاوە چارەسەرێکی زانستییانەی نوێ بەدەرکەوت کە بانگێشکردن و چەمکەکانی لاهوتی پشتگوێ دەخست و خۆی لێیان دووردەختەوە، لە بەرانبەردا پشتی بەو تێبینی و ئەزموونانە دەبەست کە لە لایەن عەقڵی مرۆڤییەوە پشتیوانیان لێدەکرا، لەو وڵاتانە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی (ئەلکەلفانییەوە) هەڵمەتێك بۆ زیندووکردنەوەی (تیۆکراتییەکەی) چاخی کۆنی (تەورات) دەستی پێکرد، کە (کاهینەکان) ڕاستەوخۆ ویستی خواوەندیان بۆ



حوکمکردنی مرۆڤ راڤە دەکرد، لێ دواجار دەرەنجامەکەی هەر ریفۆرم بوو، ئەو ریفۆرمانەی لەسەر ئەو کەنیسە نیشتیمانییانەی دەوڵەت بەسەریاندا باڵادەست بوو، گوشاری دادەناو داوای لێدەکردن شۆڕشێکی عەلمانی بکەن، تا وایلێهات چارەسەرکردنە زانستییە نوێیەکە زاڵ و باڵادەست بێت.

ئەم چاخە نوێیە کە بەوە ڕانەگەیشت قانوونی سروشتی ڕەت بکاتەوە دەکرێت بە چاخی ئاڵتوونی قانوونی سروشتی ناوزەدی بکەین، هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەمیش بەراوەستاوی هەرمایەوە، هەموو پێداگرتن و تاکید کردنەوەیەك تیایدا هەر لە سەر سیما عەقڵانییەکەی قانوونی سروشتی بوو، بەو هۆیەوەی یەزدان جیهان و هەموو شتەکانی ناو جیهانی خوڵقاندووە، کەواتە قانوونی سروشتیش لای خواوە هاتووە، بەڵام فەقیه ((جرۆسیۆس)) کە یەکێك لە بانگێشکەرانی قانوونی سروشتی و دامەزرێنەری ئەو قانوون نێودەوڵەتییەشە کە لە بنچینەی قانوونی سروشتی دانراوە، پێیوایە گەر خوداوەندیش نەبوایە پێویست بوو قانوونی سروشتی هەر جێبەجێ بکرایە. چونکە ئەو سیفەتەی تەنیا بە مرۆڤەوە تایبەتە لە عەقڵدایەو تەواوی مرۆڤایەتیش لەم ڕەگەزە عەقڵانییەدا هاوبەشن، چونکە لە کاروباری مرۆڤایەتیدا عەقڵ سیستمێکی عەقڵانی دەسەپێنێت، هەر بۆیە سیستمێك تەنیا پشت بە عەقڵ ببەستێت، پێویستە لە هەموو شوێنێکدا کارا بێت و کاربکات، بەو جۆرە دەکارین لەسەر بنچینەیەکی عەقڵانی سیستمێکی قانوونی سروشتی دابڕێژینەوە کە لەسەر ئاستی جیهانیش لەباربێت، ڕاستە لەسەر ئاستی قانوونی نیشتمانی ئەو جۆرە چارەسەرانە کاریگەرییەکی کەمیان هەبوو، تەنیا لەسەر فەقیهە تیۆرخواهەکان نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا بوونە هۆی ئەوەی لە بواری (بەکۆدکردن- نووسینەوەی قانوون، یان گونجاندن و ڕێکخستنی قانوون بەنووسراوەی) هەوڵی زۆر گرنگ بدرێت، گرنگترینیان نووسینەوەی قانوونی مەدەنی فەرەنسی بوو لە ساڵی ١٨٠٤دا. لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا

ئەو ئایدیایەی باوی هەبوو ئەوە بوو کە دەیووت مادام دەوڵەتە سەربەخۆیەکان لەبەرانبەر یەکتریدا لە بارێکی سروشتیدان بەو پێیە ئەوان قانوونی سروشتی بەڕێوەیان دەبات، بەو ڕێگایەو بەشێوەیەکی پلەبەپلە تۆوی گۆشەنیگایەکی نویّ بۆ پەیوەندی نێودەوڵەتان دەرکەوت و دووپات لەوەش کرایەوە کە پێویستە ئەو پەیوەندییانە قانوونیەکی نێودەوڵەتی بەڕێوەیان ببات.

باشە دەبێت ئەم قانوون نوێیە کە لە یەك کاتدا سروشتی و مرۆڤکرد و عەلمانی و تەواو عەقڵانیش بوو پەیوەندی لەگەڵ قانوونی مرۆڤکردیدا — پۆزەتیڤیزیدا- چی بووبێت؟ تا ڕادەیەك بارەکە هەر بە تەمومژاوی مایەوە، چونکە دەبوو قانوونی مرۆڤکرد ڕێ بە قانوونی سروشتکرد بدات کاریگەری خۆی بنوێنێت، دەشکرا وەك گریمانەیەك تا بە جوانی کێشەی نێوانیشیان بەدەرنەکەوتایە ڕێ بەوەش نەدرایە ((واتە ڕێ بە بینیی ڕۆڵی کاریگەریانەی قانوونی سروشتی نەدرایە لەو بارەدا نەبێت کە تەنازوعی نێوانیان بە جوانی بەدەرەکەوت- لێرەدا تەنازوع لەنێوان قانوونەکاندا کاتێك بەدەرەکەوێت کە دووقانوون هەبێت و نەزانرێت کە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەیەك دەبێت کامیان جێبەجیّ بکرێت — وەرگێری کوردی))، ئەوەش بارێکە کەم ڕوو دەدات، چونکە لەسەر چەمکی کردەنی قانوونی سروشتی ڕێکەوتنێکی لاواز هەیە، هەربۆیە گەر تەنازوعیش دروست ببێت ئەوا لە ڕووی تیۆرییەوە قانوونی سروشتی سەردەکەوێت، لەوبارەوە سێر (ئیدوارد کوك)) گەورە دادوەرانی بەریتانیا کە بۆ قانوونی گشتی بەریتانی (COMMOM LAW) زۆر پڕجۆش و خرۆش بوو، هەروەها بە بەرجەستەکردنی عەقڵی مرۆڤایەتی دادەنا، جارێك وتبووی: قانوونی گشتی بەریتانی لەگەڵ قانوونی سروشتیدا سنووری هاوبەشیان هەیە، جگە لەوە قانوونی گشتیش دەتوانیّ بڕیار لە پووچێتی قانوونیەکی پەرلەمانیش بدات لە بەرئەوەی ئەو قانوونیە لەگەڵ عەقڵدا دژە، بەلاّم ئەم هەڵوێستە لە بەریتانیاو لە وڵاتانی تریشدا مەزهەبێکی کردەنی نەبوو، گەرچی (بلاّکستۆن-



BLACKSTONE) لە سەدەی هەژدەمدا لە ڕێزگرتنیدا بۆ ئەو هەڵوێستە دڵسۆز نەبوو، بەلای قانوونی نیشتیمانیشەوە ئەوەی گرنگە بەشداری کردنی هزرییانەی قانوونی سروشتییە لە گەشەپێدانی قانووندا بەو پێیەی قانوون کۆمەڵێك بنەمای عەقڵانیانەی زانستیانەیە ئامانجی ئەوەیە لە هەلومەرجێکی ئابوری و کۆمەڵایەتی باودا دادپەروەری بەدیبهێنێت، هەرئەوەش بوو وایکرد لەبەرانبەر پاشماوەکانی دەرەبەگایەتیدا کە تا ئێستاش لە قانووندا زیندوون، گیانێکی دژکارانە بەرهەم بهێنێت، بەلاّم دەکرێت دان بەوەدا بنێین لە سێبەری ڕوونەدانی ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕانەدا پرۆسەی ڕزگارکردنی قانوونی ئەوروپی لەو شتە زیادانە کردەیەکی هێواش و بەئازار بوو، هەرچی قانوونی سروشتی بوو سەلماندی کە خودان تۆوێکی شۆڕشگێڕانەیە، بەشێوەیەکی تایبەتیش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو فەرەنسادا لەو بارەوە بەرهەمێکی بەپیتیشی هەبوو.

## قانوونی سروشتی و مافە سروشتییەکان

هەرچەندە لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی دیار قانوونی سروشتی هێزێکی کەنارپارێز بوو هانی ئەوەی دەدا ملکەچ بوون بۆ ئەو دەسەڵاتدارانە بنوێنرێت کە بە پێی سیستمی سروشتی کە لە خودی یەزدانەوە دەرچووە، بوونەتە دەسەڵاتدار، بەلاّم پشتیوانی کردن لە پادشانشینی و دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوا لە کرۆکی ئایدیای قانوونی سروشتیدا نییەو داوای پەیگیریشی ناکات، تەنانەت لە چاخەکانی ناوەڕاستیشدا نووسەرانی لە چەشنی ((مارسیلسۆ ئۆف بادوا MARILION OF PADUA-)) داوای کردووە دیموکراسی نەك تەنیا لە بەڕێوەبەردنی دەوڵەتدا بەڵکو پێویستە لەسەر بنچینەی پرەنسیپەکانی قانوونی سروشتی لە کەنیسەی کاتۆلیکیشدا پەیڕەوبکرێت، لە پاش ڕێنیسانسەوە ئەو هزرانە زیاتریش بلاّوبوونەوە، ئەو

ئایدیایەی کە دەیووت مرۆڤ لە باری ئاسایی خۆیدا هەندێك مافی بنچینەیی خۆی هەیە پاشتر پشتیوانییەکی زۆری پەیدا کرد، بەتایبەت هەمان ئایدیا دەڵێت مرۆڤ پاش ئەوەی کۆمەڵگەی شارستانیش پەیدا بوو ئەو مافانەی بۆ بارودۆخە نوێیە مەدەنییەکەی گواستۆتەوە کە لە کۆمەڵگە مەدەنییەکەدا بەدەستی هێناوە، هێشتا ئەو مافانە بە هۆی قانوونی سروشتییەوە زامن کراوە، (لۆك- LOCKE) کە قانووندانەرێکی بەریتانی بوو ئەم ئایدیایەی زیاتر بەرەو پێشەوە نارد کاتێك وتی بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی (ئەو پەیمانەی زۆربەی نووسەران پێیانوابوو لانی کەم لە رووی تیۆرییەوە بناغەی کۆمەڵگەی مەدەنییە) دەسەڵات پێویستە کاتێك بە حکوومەت بدرێت کە گەل متمانە بەو حکوومەتە بهێنێت، هەر کاتێکیش ئەو حکوومەتە هەر کام لە مافە بنچینەییەکانی گەلی پێشێلکرد ئەوا ئەو متمانەیەش بە کۆتا دێت و گەل سەرپشك دەبێت سەرلەنوێ دەسەڵات وەربگرێتەوە.

بڕواهێنان بە بوونی قانوونی سروشتی ئەو پشتیوانەیە کە ئایدیای مافە سروشتییەکان پشتی پێدەبەستێت، چونکە مافێکی لەو جۆرە بە هۆی قانوونی سروشتییەوە شەرعی و سەپێنراویش دەبێت، هەر بەم هۆیەوەش بوو لەسەر (تەرکیز) کردن جودایی دروست بوو، پاش ئەوەی لەسەرەتاوە وا تەماشای قانوونی سروشتی دەکرا فەرمانەکان و شتە قەدەغەکراوەکان دەسەپێنێت، لەوەدواو ئێستا ئیتر وا سەیری دەکرێت کە سەرچاوەی ئەو مافە دیموکراتی و بنچینەییانەیە کە ئازادی ئەو دەسەڵاتدارانە سنووربەند دەکات کە وایاندەزانی خودانی دەسەڵاتێکی رەهان، شۆڕشی ئەمریکا بە فەلسەفەکەی (لۆك)ەوە زۆر کاریگەر ببوو، هەروەها دەستوری ئەمریکا بەشێوەیەکی سەرەکی بەڵگەنامەیەکی قانوونی سروشتییە کە لە ژێر سێبەری قانوونی سروشتیدا دەسەڵاتی سەرەکی گەل جێگیردەکات و، مافە سروشتییەکانی هاوولاتیانیش زامن دەکات، ئەم دەستووورە بەشێکی زۆری



کەلەپوری قانوونی سروشتی بۆ جیهانی هاوچەرخ گواستەوە، تەنانەت لەو کاتەشیدا کە هزرەکانی قانوونی سروشتی بەرەو کەنارگیری و بنبەست بوون دەگەیشتن، دەستووری ئەمریکی نەك تەنیا بە لەحیمێکی هەتاهەتایی قانوونی بە ئایدیای ئازادییەوە بەستەوە، بەڵکو ئەو دەستوورە هزرێکی نایابی زۆر کاریگەری چەرخی نوێمانی پاراست کە ئەویش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە دەکرێت مافە سروشتییەکان ببنە بابەتێك بۆ زامنکارییە قانوونییەکان، ئەو زامنکارییە قانوونییانە دەکرێت دەستی بەسەر دابگرێت هەروەك چۆن دەست دەگرێت بەسەر ئەو ماف و ئەرکانەدا کە قانوونی مرۆڤکرد ئەیدات، یان دەیسەپێنێت، مادام ئەو مافانە لە دەستووردا نووسراون ئیتر بۆتە خودان بەگێتییەکی تایبەت کە دادگاکانی وا لێکردووە وەکو مافێکی زۆر باشی بڵند تەماشای بکەن، بەجۆرێك لەسەروو هەموو قانوونو تەشریعێکەوە بێت کە دژی دەوەستێتەوە، بەو جۆرە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ئامرازێکی کردەنی دروست بوو کە بە هۆیەوە ئەم مافە سروشتیانە بۆ ناوجەرگەی قانوون گوازرانەوەو ئیتر وەکو مافی شەرعییەتدار دانیپێدانراو و هێزی ئەوەشی پێدرا کە دەبێت جێبەجێ بکرێت.

دیسان (رۆسۆ- Rousseau)ش دووەمین کەس بوو کە کاریگەرییەکی گرنگی هەبووە بەسەر دەرەنجامە شۆڕشگێڕییەکانی قانوونی سروشتیەوە، رۆسۆ لە هەندێك پرەنسیپی دیکەوە دەستی پێکرد کە لە پرەنسیپەکانی لۆك جیاواز بوون، بە وتەی رۆسۆ قانوونی سروشتی دوورە لەوەی مافی سروشی وا بۆ تاکەکەسان بخولقێنێت کە بە (تێپەڕبوونی کات - تەقادووم) پووچ ببێتەوە، بەڵام بە تەواوی گەل دەسەڵاتێکی رەهای وای دروست کردووە کە کەس ناتوانێت دەستبەرداری ببێت، هەر لەو پێناوەشدا قەوارەیەکی تەمومژاوی وای خولقاندووە کە (ویستی گشتییە) کە لە تەواوی ویستەکانی تری هاولاتیانەوە جیاوازە، ئەو ویستە گشتییە لە دەوڵەتدا تاکە دەسەڵاتی ئازادو سنووردارنەکراوە، هەردەسەڵاتدارێکیش گەر متمانەی

ویستی گشتی دۆڕاند ئەوا خۆی رووبەرووی کەوتن و لەناوچوون دەکاتەوە، لەم گۆشەنیگایەوە ئەم مەزهەبە لە چاو مەزهەبەکەی (لۆك)دا شۆڕشگێرانەترە، چونکە گەل بە دەسەڵاتداری راستەقینە دادەنێت کە دەتوانێت تەنانەت پاشاکانیش لاببات، هەرلەبەر رۆشنایی ئەم بۆچوونەوە بوو فرەنسییەکان رژێمی کۆنی خۆیان لەناوبردو، قانوونی عەقڵی سروشتیان لە جێی دانا، بەداخەوە سنووری پرەنسیپەکانی رۆسۆ هێندە دیارو روونن بە جۆرێك (فەوزەوییەکیش) گەر بانگەشەی ئەوەی کرد نوێنەرایەتی ((ویستی گشتی ))دەکات، ئیتر دەتوانێت بەهۆیەوە دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت و فەرمانڕەوایی خۆی بسەپێنێت، جگە لەوانە چارەسەریەکەی رۆسۆ بەکردەنی تەنانەت لە ژێر سێبەری سیستمێکی دیموکراتی رێکوپێکیشدا زۆرداریێتی زۆرینەی سەپاند، هەرچی کەمینەی ئۆپۆزیسیۆنیشە بۆ ئەوەی ئازاد بێت دەبێت ناچاری ملکەچی بکەیت بکەیت (هەروەکو وتەکانی رۆسۆ دووپاتی لێدەکەنەوە)، هیچ تێکستێکیش نەبوو بۆ ئەوەی لە بەرانبەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا مافە سروشتییەکانی تاکەکەسان پارێزراو بێت، بەهۆی ئەم سیما تەمومژاوییەی ((ویستی گشتییەوە)) وەك ئەوەی قەوارەیەکی تایبەتمەندو جیاوازە لە تاکەکەسان، دەکرێت بەو ئایدیایەی هیگل بەراوردی بکەین، کە باس لەوە دەکات لە چاوو ئەو هاوڵاتیانەی کە دەوڵەتەکەیان پێکهێناوە دەوڵەت کیانێکە عاقڵترو راستەقینانە ترە، بەو جۆرە (رۆسۆیزم) کە لە سەرەتاوە سەرچاوەی لە دیموکراسی و ئازادییەوە وەرگرتبوو، بووە ئامرازێك بەدەستی تۆتالیتارییەکانەوە (واتە دەسەڵاتی تاك حزبییەوە).



## قانوونی سروشتی و چارەسەرییە نوێیەکان

لە سەدەی نۆزدەیەمدا قوتابخانەی قانوونی سروشتکرد تەواو سەرەولێژ بۆوە، قانوونی مرۆڤکرد جێی گرتەوە،کە بە گەشەکردنی پۆزەتیڤیزمی زانستیی و(کە لە بەشی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین) بەو قوتابخانەی مێژوویێتییەوە بەند بوو کە بە هیگلێتییەوە پەیوەستی هەبوو، (لانی کەم لە شێوازە ئەڵمانییەکەیدا)، بۆ کەمکردنەوەی جۆش و خرۆش بۆ قانوونی سروشتی، کۆمەڵێك هێز یەکریز بوون، بێگومان قودرەتمەندترینی ئەو هێزانە لەو کاردانەوەدا خۆی دەبینیەوە کە لەسەر ئەو عەقلانیەتە هەبوو کە لە سەدەی هەژدەیەمدا لای فەیلەسووفەکانی (رۆشنگەری) باوی بوو، هەروەها ئەو هەستەشی پێیوابوو قانوونی سروشتی هیچ بناغەیەکی زانستی، یان فەرماندارێتی نییە، ئەو رۆڵە زیندووەی فاکتەرە مێژووییەکانیشی پشتگوێ خستووە کە لە گەشەپێدانی قانوونی سروشتیدا هەیانە، زێدەباری ئەوە پەیوەندی مافە سروشتییەکانی گەل (هەروەها تاکەکەسانیش) بە شۆڕشی فرەنسییەوە تاموبۆنێکی وای بەخشییە مەزهەبەکە کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا لە گۆشەنیگای دەسەڵاتدارە کۆنەپەرستەکان و لایەنگرانیانەوە وەك ئەو تاموبۆنە وابوو، کە زیاتر بە ((تاموبۆنی پۆڵشەڤییانە)) ناودەبرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئایدیای قانوونی سروشتی نەکوژایەوە (بەراستیش ئەو ئایدیایە هێزەی ئەوەی هەیە بمێنێتەوەو نەکوژێتەوە) چونکە لەم چەرخەی خۆشماندا بە چەندین شێوەو شێواز خۆی دەرەخاتەوە، هێزی خۆی بۆ مانەوە هێشتەوە بەهۆی ئەو هەموو هەڵەو تاوان و وەحشێتگەرایی و شورەییانەی لە هەردوو جەنگە جیهانییەکەو لە ساڵانی نێوان هەردوو جەنگەکەدا ئەنجامدرا، لێرەدا بەکورتی باس لە چەندین نموونەی تێوریانەی قانوونی سروشتی لەم چەرخەدا دەکەین و دواتر تایبەتمەندێتی و بایەخی زیندووکردنەوەی قانوونی سروشتی هاوچەرخ دەرەخەین بەتایبەتی لە ئەوروپاو ئەمریکا.

دەکرێت تیۆرەکانی قانوونی سروشتی بۆ سێ پۆل پۆلێن بکەین: کاسۆلیکێتی، فەلسەفیانەو سۆسیۆلۆژیانە، یەکەمیان تیۆری کاسۆلیکێتی هەتا نها لەو ولاتانەدا کاریگەرە کە کەنیسەی کاسۆلیکی دەسەلاتێکی حساب بۆ کراوی هەیەو، لەوێ هێشتا ئەو شێوەیەی خۆی پاراستووە کە لەسەر دەستی تۆما ئەکوینی نەخش کرابوو، هەرچەندە هەولیش دەدرێت بەپێی هەلومەرجە نوێیەکان چەمکەکانی بگونجێنرێن، بەجۆرێك ناویشی لێنراوە (نیو تۆمیزم- New-Thomism))- تۆمیزمی نوێ- لە کیشوەری ئەوروپاشدا شێوازی فەلسەفیانەی قانوونی سروشتیش بلاوبۆوەو شێوازی ((نیو کانتی – New Kantismi)) کانتیزمی نوێی گرتوە، واتە ئەو شێوازانە هەولیان دەدا ئایدیای کانت لەسەر جیهانی قانوونی ئاکاریانە گەشەپێبدەن، کانت ئەوەی چارەسەرکرد بەلام کارێکی رەهایانەشی تیادا بوو، بەو پێیەی ئێمە دەبێت بەشێوەیەك هەلسوکەوت بکەین کە بکرێت بۆ قانوونیەکی گەردوونیانە وەربگێڕدرێت، ئەو فەرمانانەش لە پرەنسیپی سروت و (ئیلهام) دا راستێتی رەهایانەی خۆیان دەبینیەوە، کەچی هەروەك پرەنسیپێکی رووکەشیانە مایەوە بەبێ ئەوەی ناوەڕۆکێکی تایبەت و دیاری هەبێت، ستملرو-stammler- وڤیشیۆ- vecchi- فەیلەسووفانی کانتیزمی نوێ هەولێکی زۆریان دا تا ئەو فەرمانانە پوخت بکەنەوە کە قانوونی گەردوونیانەی کانت لە خۆیدا هەلیگرتبوو، سملر لەو بارەوە دانی بەوەدا ناوە کە فەرمانگەلێکی لەو جۆرانە ناکرێت وەها بن قابیلی ئەوە نەبن کە لە هەموو سەردەم و چاخێکدا گۆڕانیان بەسەردانەیەت، چارەسەرییەکەی خۆی بە ((قانوونی سروشتی خودان ناوەڕۆکی گۆڕاوو)) ناوزەد کرد، ئەو جۆرە چارەسەرییە فەلسەفیانەی پێداگرتنێکی ناپێویستی لەسەر مەنتق دەگرت، لەو ولاتانەی ((قانوون گشتییەکانیان -common law)) پەیڕەو دەکرد کاریگەرییەکی لاوازیان هەبوو، ئەو قانوونیانەی زیاتر حەزیان بە ئەو چارەسەریانە هەبوو کە پشتیان بە تێبینی و ئەزموون دەبەست.



ئەو دوو جۆرە تیۆرییەی پێشتر ئاماژەمان پێدا بۆ قانوونی سروشتی گۆشەنیگایەکی ئایدیالیستیانەیان هەبوو، واش لەگەل سروشتدا مامەلەیان دەکرد شتێکە پێوانەیەکی ئایدیالیستیانە دەسەپێنێت و تارادەیەکی زۆریش لە جیاتی عەقلانیەتی مرۆڤ پشت بە گریمانەگەلێکی زۆردارانە دەبەستێت، هەرچی تیۆرەی جڤاکیانەی - ((سۆسیۆلۆژیانەیە)) قانوونی سروشتییە چارەسەرییەکی زیاتر واقعیانەی هەیە، ئەو پێشکەوتنە گرنگەی لەوبارەوە روویدا لەوەدا بوو کە هەولدرا ئەو شێوازە زانستیانەی لە زانستە جڤاکییەکانەوە بەدەست هاتبون هەولدەدرا پیادە بکرێت، تا لە پێداویستی و نموونەی ئەو ئاکارانەوەی کە لە کۆمەلگەدا پێویستن راستییە سەرەتاییەکانمان چنگ بکەوێت، ئەو پێداگرتنەی لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا لەسەر زانستە کۆمەلایەتییەکان دەکرێت، بۆتە هۆی ئەوەی گەشەکردنێکی وا رووبدات کە لە هیچ شوێنێکی دیکەی دنیادا نییە، لەوێدا دەبینین بەرگری لە قانوونی سروشتی دەکرێت لە دژی ئەو هێرشانەی لەلایەن پۆزەتیڤیزمەوە دەکرێتە سەری، ئەوەی بە عەمبارێکی زەبەلاحی چەکی پۆزەتیڤیزمیانەوە ئەنجام دەدرێت، ئەوکاتەی هاتینە سەر باسی ((پۆزەتیڤیزمی)) راستی و دروستی ئەو بیانووهێنانەوانە دەرەخەین کە لە رێگەی زانستەوە بۆ قانوونی سروشتی دەکرێت. چونکە شوێنی گونجاوی خۆی ئەوێیە.

زێدە لەسەر ئەوانەش لای پارێزەرە دیارەکان شتێکی باوە کە لە وتارە گشتییەکانیاندا بەشێوەیەکی گشتی پشتگیری خۆیان بۆ قانوونی سروشتی دەرەخەن، بەلام ئەو پشتگیری کردنە زیاتر تەمومژاویەو دەکرێت وای دابنێین بەشێکە لە سروشی وتاربێژی هەروەك چۆن لەلای وتارویژەکانی رۆمای کۆن باوی هەبووە، زیاتر لەوەی حسابی ئەوەی بۆ بکەین هەولدانێك بێت تا ناوەڕۆکێك ببەخشینە ئایدیای یاسی سروشتی، یان بمانەوێت بەشداریکردنی ئەو قانوونیە لە جیهانی هاوچەرخمان دەربخەین.

## بوژانەوەی قانوونی سروشتی لە پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە

زانینی هۆکارەکانی بوژانەوەی قانوونی سروشتی ئاسانە، دەرکەوتنی دیکتاتۆریەتی فاشیزم و نازیزم، و بڵاوبوونەوەی تۆتالیتاری، و ویستی گەلانی زلهێز بۆ رەتکردنەوەی هەموو ئەو پێودانگە ئاکاری و کلتورییانەی لە شارستانێتی مرۆڤایەتیدا بەشتگەلێك دادەنران، کە دەست لێ هەڵگرتنیان مەحاڵە، ئەم هۆکارانە بوون وایانکرد دیسان دەست کرا بە توێژینەوەو پشکنینەوەی پرەنسیپەکانی قانوونی سروشتی و حکوومەتەکان، ئەم پرسیارەش کرا ئایا راستە پۆزەتیڤیزمیەکان بەو جۆرە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە پێویستە مل کەچی بۆ قانوونی مرۆڤکرد هەبێتن ئیتر ناوەڕۆکە ئەخلاقییەکەی هەرچۆنێك بێت، و هەر ئاکارێکیش بسەپێنێت تەنانەت ئەو ئاکارە لەگەڵ هەموو ئەو هاوکێشە ئەخلاقی و شارستانییانەشدا جیاوازبێت کە بۆمان ماوەتەوە.

ئەم پرسیارە بووە جێی بایەخێکی زۆر بەتایبەت لە پاش کەوتنی نازیزم لە ئەڵمانیا، لە دادگایی نۆرمبێرگدا کە بۆ دادگایی کردنی سەرانی نازیزم پێکهاتبوو، هەموو بایەخێك لەسەر پێگەی ئەو کەسانە کۆبۆوە کە لە ئەنجامدان و رێکخستنی قەسابخانەکانی ناو زیندان و سەربازگەکانی نازییەکاندا بەرپرسیار بوون، ئەو قەتلوعامکردنانەی بەپێی قانوونی کارپێکراوی وڵاتی خۆیان ئەنجامیان دابوو، ئایا هیچ قانوونیەکی بەرزتر هەیە بڕیار لەوە بدات کە ئەو کردەوانەی ئەوان پێویستە بکەرەکانیان سزا بدرێن، ئیتر قانوونی وڵاتی تۆمەتبارکراوەکە هەرچۆنێك بێت؟ بۆ ئەوەی لەو ئاڵۆزی و کێشەیە دەربچین قانوونی سروشتی دەتوانێت دەلیڤەو بوارێك بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ سەقامگیرکردنی قانوونیەکی لەو جۆرە لەسەر بنچینەیەکی تەمومژاوی جۆرە دوودڵییەك هەبوو، حەزی ئەوە هەبوو لەسەر بناغەو بنچینەیەکی قانوونی زیاتر پتەو رۆشنتر بچەسپێت، دادگاییەکانی نۆرمبێرگ لەسەر ئەو بنچینەیە چارەسەرکرا، جا -راست بێت، یان هەڵە- ئیتر بووە پێشکەوتنێك لە قانوونی نێودەوڵەتیدا کە سەرچاوەکەی باوە —عادەت-ە.



بێگومان کە بناغەی مێژووییانەی ئەو قانوونیە لە قانوونی سروشتیدایە، ئەوە وایکرد لە چاوی زۆرێك لە پیاوانی دەوڵەت و پارێزەران و توێژێکی فراوانی خەڵکدا ئەو پێشکەوتنە، یان ئەو چارەسەرییە رێزلێگیراو بێت.

لەسەر حکوومەتی فیدراڵی ئەڵمانیا پێویست بوو مەسەلەی شەرعیبوون، یان نەبونی ئەو قانوونیانە چارەسەر بکات کە لە سەردەمی حوکمی نازیزمدا بۆ هەلومەرجێکی تایبەت پەیڕەو کراوە، ئایا تاوانبار دەتوانێت پشت بە قانوونیەکی نائەخلاقیانە ببەستێت تا بیانوویەکی شەرعی بۆ ئەو زیانانە بهێنێتەوە کە لە کەسێکی دیکەی داوە؟ بۆ نموونە زۆر ئافرەت هەبوون دەستیان لە مێردەکانیان هەڵگرتووەو جستابۆیان (کە دەزگای پۆلیسی سیاسی نازییەکان کە دەزگایەکی نهێنی بووە-وەرگێری کوردی) لێ ئاگادارکردۆتەوە، کە گوایە مێردەکەی دژی نازییەکانە، ئایا ئەو ژنە دەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات بەوەی لەگەڵ مێردەکەی جیابۆتەوەو لەژێر زۆرەملێی قانوونی ئەو کاتی نازییەکاندا مێردەکەی تەسلیم بە جستابۆ کردووە؟ زۆر دادگای ئەڵمانی هەبوون ئارەزوویان دەکرد لەسەر بناغەکانی قانوونی سروشتی ئەو جۆرە کێشانە چارەسەر بکەن، هەرچەندە ئەو ئاراستەیەیان نەدەگرتەبەرو رێگا چارەی تریان دەدۆزییەوە لە چەشنی راڤەکردنی قانوونی نازییەکان بەوەی لە بەرژەوەندی تۆمەتبارکراودا نییە.

دەبێت ئاگاشمان لەوە بێت لەسەدەی نۆزدەمدا ئەو کاتەی قانوونی سروشتی لە بنبەستی و تەنگەبەریدا بوو، ئەو کات جێگرەوەی ئەو بڕواو ئیمانە بوو بەوەی مرۆڤ لە رووی ماددی و ئەخلاقیەوە دەتوانێت پێشبکەوێت، بڕوایەکی پتەو بەوەی دەزگا شارستانییەکان تۆکمەتر دەبن و پلەبەپلە لە هەموو جیهاندا بڵاودەبنەوە، ئیتر گرنگ نەبوو بووترێت قانوون مرۆڤکردەکان پشت بە قانوونی سروشتی دەبەستن، چونکە دەبوو ئەو قانوونیانە بەدیهێنانی ئامانجە باڵاکانی مرۆڤیان وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بکردایەتە جێ نیشانەی خۆیان، لەگەڵ ئەوەشدا دەنگێکی ناڕەزای وەك دەنگی (نیچە)ش دەبیسترا، کە بەرانبەر تەواوی زانستی کلاسیکی ئەخلاق گومانێکی زۆری نیشان دا، ئارەزووی خۆشی نیشاندا ئەخلاق بۆ پەرستنی مرۆڤی سوپەرمان بگۆڕدرێت، یان بۆ پەرستنێکی (تۆلستۆ)

بیانە بگۆڕێت، کە بۆ بەرژەوەندی تێڕوانینێکی تایبەتیانەی کەسێتی بۆ ئەرکە سەرەتاییە مەسیحییەکان، لە هەموو قانوونو حکوومەتەکان خۆی بێ بەری دەکرد، ئەم بۆچوون و هزرو بیروباروەرانەی چەشنی ئەوانیش نیشانە بوون بۆ ئەو ناعەقلانێتەی دەستی بەوە کردبوو هەموو بوارەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی داگیربکات، ئەوەش وەکو کاردانەوەیەك لەدژی ئەو ئەزموونەی عەقلانێتی زانستی لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزەدا هەیبوو، خوێنەران لەوانەیە رۆمانەکەی ((تۆماس مان))یان لەبیرمابێت کە ساڵی **١٩٢٦** لە ژێر ناوی ((چیای ئەفسووناوی))دا بڵاوی کردەوە، بەتایبەت ئەو دایەلۆگەی لەنێوان کەسێکی پێشتر یەسووعی بەناوی ((نفتا- NAFTA ))و مندالێکی سەردەمی رۆشنگەری بەناوی ((ستنبرینی- SETTEMBRINI))کە چۆن هێزی عەقلانیەت و هێزی ناعەقلانی رووبەرووی یەکدی دەبوونەوە بەبێ ئەوەی هیچ دەرئەنجامێکی یەکلاکەرەوەی لێبکەوێتەوە. هەردوو قانوونی مرۆڤکرد و سروشتیش لەیەك تایبەتمەندێتیدا هاوبەش بوون کە ئەویش بڕوایانە بە عەقلانیەت، گەرچی رێگاکانیان جیاوازە، بێگومان ئەوەش لەو گواستنەوەیەدا رۆڵی خۆی هەبوو کە لە سەدەی نۆزدەمدا بە شێوەیەکی تا رادەیەك هێمنانە لە عەقلانێتی قانوونی سروشتییەوە گواستنەوە رووبدات بۆ ئیمانێکی عەقلانییانە لە قانوونی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، لە راستیدا لەو سەدەیەداو بەهۆی پەرەسەندنێکی بڵاوی ئایدۆلۆژیا ناعەقلانییەکانی وەك نازیزم و فاشیزم، ئەو ئیمانە عەقلانییەی بڕوای بە قانوونی سروشتی هەبوو، هەستی بەوە کرد کە پێویستە دووپات لەخۆی بکاتەوە، لێ بۆ ئەو مەبەستە خۆی خستە سەرئەو بڕوایەی کە پۆزەتیڤیزم دوژمنێکی سەرەکی ئەوە، ئەوێك کە لەسەر بنچینەو گریمانەی عەقڵی بنیاتنرا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دژە هێرشەی قانوونی سروشتی بۆسەر (پۆزەتیڤیزم- مرۆڤکرد) ئەنجامیدا شالاوێکی نامەنتیقیانە بوو، چونکە ئەو پۆزەتیڤیزمی بوو لە فەوتانی دەسەلاتی قانوونی سروشتیدا رۆڵێکی دیرۆکی گێڕابوو.



## گونجاندنی قانوونی سروشتی لەگەڵ جیهانی تازەدا

سەبارەت بە هزری قانوونی سروشتکرد ئەوەی ئەمڕۆ دەتوانین بیلێین، چ پشتیوانی بێت، یان دژی بێت، ئەوەیە، تا ئەو کاتەی هەلمان بۆدەرەخسێ سەرلەنوێ بە باگراوندی هزری پۆزەتیڤیزمی و باری هەنووکەیی و پەیوەندییەکانی بە تێوری قانوونی دابچینەوە، پێویستە قسەکردن لە قانوونی سروشتی دوابخەین، لێ پرسیار سەبارەت بەو هاوبەشیکردنە کردەنییەی ئەم مەزهەبە بکەین کە لە پێناوی چارەسەری ئاریشە قانوونیی و ئەخلاقییەکانی جیهان پێشکەشی کردووە، ئەوەش بزانین ئاخۆ پەیوەندی بەو ململانێ ترسناکانەوە هەیە کە تا ئێستا مرۆڤ لە بوارەکانی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی و تەنانەت لە بواری بۆشایی ئاسماندا بەدەستییەوە دەناڵێنێت.

پێشتر روونمانکردەوە کە ئایدیای قانوونی سروشتی مەزنترین پێشکەوتنی بەرهەمداری بەخۆوە بینیوە کاتێك لە دەستووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا خرایە ناو بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤەوە، پاشتر هەموو ئەو دەرەنجامانەی کە لەوەوە کەوتەوەو، دەسکەوتی ئەوەی ئەو مافانە دانپێدانانێکی نێودەوڵەتیشی بۆ خۆی مسۆگەر کرد، نەتەنێ بەناوەرۆکێکی دەستنیشانکراو، بێگومان ئەو کارەش لە سەرەتاوە قەرزاریاری قانوونی سروشتییە، ئەمە جگە لەوەی لە ئەمریکاو ولاتانی تریش لە پرۆژە تایبەتەکانی مافگەلی سروشتی پەنا بۆ قانوونی سروشتکرد براوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەرکە پێوانەیەك بۆ بەهاکان قەبووڵ بکرێ و، جێگیرکردنی ئەو بەهایانە بە شێوەیەکی گونجاو لە تێکستی قانوونی لە ناو دەستووردا، ئەوە لەسەر دەسەلاتی دادوەری پێویستە ئەو تێکستانە راڤە بکات، بەپێی بوار و توانا، بەپێی رۆحی دەستوورەکە نەك بەپێی حەرفێتی تێکستەکە، هەروەك چۆن لە رێگەی راڤەکردنی فراوانەوە تێکستەکانی تر راڤە دەکا، قازی ناتوانێت سیستمێکی تەمومژاوی قانوونیی خودان ناوەڕۆکێکی یەکلایی نەکراوە بەکاربهێنێت، کە هێشتا بوونی ئەو سیستمە جێی مشتومڕ بێت و فەرمانە فیعلییەکانی، یان ئەوەتا بەشێوەیەکی راست، یان بەشێوەیەکی هەڵە لە قانووندا تۆمار کرابن، لە هەردوو بارەکەشدا نە هاوجووت دەبێت و نەشایستەش دەبێت، چونکە ئەرکی ئەو وەکو قازی راڤەکردنی راست و دروستی دەستوورە نە تێگەیشتنی تایبەتی خۆی

سەبارەت بە سیستمێکی قانوونی باڵاتر پێشکەش بکات، کە باوەڕی وابێت قانوون لەوەوە، یان لە سیستمێکی دیکەوە هەڵهێنجرابێت.

لە پاڵ ئەو مافانەی بەهۆی دەستوورەوە زامنکراون، داخوا قانوونی سروشتکرد هەندێك بانگەشەو لاف و گەزافیشی تریشی هەن، تا کار بەوە گەیشتووە هەندێك لەوانەی بەتاوو جۆشەوە دڵیان بۆ مافگەلی سروشتی لێ دەدا، هەموو ئاماژەیەك لەلایەن بڕیارێکی قانوونییەوە دەبەنەوە سەر بیرورای لە چەشنی ئەوە مەعقوڵە، یان ئەوە دادپەروەرە، یان شتێك بەنییەتێکی پاکەوە کراوە، جا لە هەر قانوونێکدا بن وا لێکدەدەنەوە کە لە بنچینەدا پشتیان بە قانوونی سروشتی بەستووە، بەڵام هیچ بیانوویەکیش لە ئارادانییە تا بگوترێت سیستمی قانوونیی مانایەکی مەزنتری دەبێت، کاتێك بەکاردەهێنرێت، لەجیاتی ئەوەی ئاماژە بەهەندێك لەو پرەنسیپ و چەمکانە بکات کە لە کۆمەڵگەدا باویان هەبووە، هەرچەندە هەموو سیستمێك پێویستی بەوە هەیە لەو جۆرە چەمکانە بەکاربهێنێت، بەبێ ئەوەی ئاماژە بکات بۆ چەمکی قانوونێکی باڵاتر لە قانوونی مرۆڤکرد و ئەوەی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ((مولزەم)) دەبێت، راستە لە هەندێك باردا سیستمی قانوونیی پەنا بۆ دادپەروەریی سروشتی دەبات، بۆ نموونە قانوونی ئینگلیزی ماوە دەداتە بڕیارێکی دادگایەکی ناوخۆ ئەگەر بڕیارەکەی پێچەوانەی دادی سروشتی بوو (لە نموونەی ئەو بڕیارانەدا بڕیاری سەندیکاکانی کرێکاران، یان یانەیەك یان رێکخراوێکی پیشەیی بە دەرکردنی ئەندامێکی خۆیان) یاخود دادگایەکی ناوخۆ کاتێ رازی نەبێ لەسەر ئەم بناغەیە هێزی جێبەجێکردن بداتە بڕیارێکی بیانی، بەڵام ئەم گوزارشە مانای تری نییە جگە لەوەی پێداویستییەکە بۆ گونجاندن لەگەڵ هەندێك لەو پێودانگانەی کە قانوونی بەریتانی بە پێویستیان دەزانێ، هەربۆیە کاتێك ئەندامی یانەیەك دەردەکرێت، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی دادپەروەرانە لەسەر بڕیارێکی لەو جۆرە کارێکی ((ئیلزامییە)) بۆ مامەڵەکردنیش لەگەڵ بڕیارێکی بیانیدا هەمان حاڵ راستە. بڕیارێك کە پێویستی بەوە هەبێت سیفەتی جێبەجێکردن وەربگرێت، ناشکرێ دانی پێدابنرێت ئەگەر هاتوو لە ئەنجامی ((**تدلیس**))ەوە دەرکرابێ، یان بەبێ ئەوەی حوکمەکە بە شێوەیەکی راست و رەوان بە بڕیارلەسەردراو و راگەیەنرابێت، لەو بارانەدا قانوون پێشوەختەبوونی قانوونێکی باڵاتر ناسەپێنێت تا بەهۆیەوە هەڵوێستی قانوونی بەریتانی راڤە، یان شیبکاتەوە، چونکە ئەو بۆ



خۆی دەسەڵاتی ئەوەی هەیە سەبارەت بە پێداویستی و داخوازییەکانی دادپەروەری تیۆرێکی تایبەت بخولقێنێت.

بەڵام لە هەمبەر مەسەلەیەکی وا ترسناك و جێی گوماندا کە لە سنووری قانوون و ئەخلاقدا روودەدات و گومان و دژبەیەکی و چەندوچوون دەخاتەوە، لەسەر قانوون پێویستە چارەسەر بۆ ئەو مەسەلانە بدۆزێتەوە کە بە ژیانی مرۆڤ و کوشتنی میهرەبانانەو خۆکوشتن و لەباربردنەوە پەیوەستە، جا یان بەرێگە پێدانیان، یان حەرامکردنیان بە مەرج، یان بەبێ مەرج، مەسەلەی ئەوەی ئاخۆ پێویستە قانوون سزای لە سێدارەدان بسەپێنێت، یان نەیهێڵێت دیسان چەندو چوونێکی ئەخلاقیانەی توندی لێدەکەوێتەوە، ئەو مژارە ئاکارییە هەستیارانەی زۆر گرانن بەسەر هەر سیستمێکی قانوونییەوە کۆت وبەندی گران دادەنێت، دیسان چەندوچوونێکی جڤاکی و ئەخلاقی و پراکتیکی و فیقهی سەبارەت بە حەرامکردن، یان رێگەپێدانی ئەو جۆرە کارانە دەخاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا جێی گومانە ئاماژەدان، یان گەڕانەوە بۆ سیستمێکی سروشتی، یان ئەخلاقی باڵا لەو جۆرە دژایەتییانەدا کەڵکێکیان هەبێت، گەر بێتو رێکەوتنێکی پێشوەختە لەسەر بوون و ناوەڕۆکەکەی هەبێت، کێیە بڕیار لەوە دەدات کە قانوونی سروشتکردی لەباربردن، یان سزای لەسێدارەدان قەبووڵ دەکات، یان رەتی دەکاتەوە؟ بە دڵنیاییەوە گەر مرۆڤایەتی دەزگایەك قەبووڵ بکات وەکو کەنیسەی کاسۆلیکی، کە دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت بڕیار لەو مەسەلانە بدات و دەسەڵاتی راڤەکردنی ئەو قانوونانەشی هەبێت، ئەوا وەڵامی ئەو مەسەلەیە حازربەدەست دەبێ، دەشکرێت بگووترێت ئەو چارەسەرە لەوانەیە جێی ئەم سیستم، یان ئەو سیستمی قانوونیی بگرێتەوە. هەرلە سەردەمی چاکسازییەوە تا ئێستا بۆ روودانی کارێکی وا بۆرە هیوایەك هەیە، بەتایبەت کە پاش دەرکەوتنی هێزی نوێی کۆمۆنیستیی، جیهان دابەش بووە[1].

١- تۆ بڵێی دانەری ئەم کتێبە، کە ئێستا زیاتر لە ١٥ ساڵ دەبێ کە بلۆکی کۆمۆنیستی هەڵوەشاوەتەوەو دنیایەکی یەك جەمسەر بەسەرکردایەتی ئەمریکا پەیدابووە، چی لەمبارەوە بگوتبا (بڵاوکەرەوە).

ئاخۆ کاتێك دێینە سەر بواری نێودەوڵەتی، دەکارین بێژین بوونی سیستمگەلێکی قانوونی دژبەیەکی گەلان، کە هەر هەموویان پێ لەسەر پێداویستیی تاك تاکەی وڵاتی خۆیان و داخوازییەکانی خۆیان دادەگرن، دەکرێت بڵێین پێویست بەوە دەکا دان بە سیستمێکی دادپەروەری باڵا دابنرێت کە لە رێگەیەوە چارەسەرێکی قایلکەر بۆ هەموو هۆکاری ئەو ناکۆکییانە بدۆزێتەوە؟ پێویستبوونی ئەو جۆرە سیستمە هیچ رۆژێك وەکو ئەمرۆ بەپەلەو گرنگ نەبووە، کە دەبینین جیهان بۆ سەر چەندین ناوچەی پێکناکۆك و بۆ چەندین پارت و ئایدۆلۆژیا دابەش بووە، سەرباری ئەوە چوونەناو بۆشایی ئاسمان و ئەنجامدانی گەشتی فەزایی بەناو هەسارەو ئەستێرەکاندا هەموویان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە پێویستە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەشێوازێکی عەقڵانی گەشەی پێبدرێت، بۆ رووبەڕووبوونەوەی پێداویستییەکانی ئاشتی و دادپەروەری و خێری مرۆڤایەتی پێوانەی ئاکارەکی دابنرێت. ئاماژەدان بەو ئاریشەیە مانای ئەوە نییە لافی ئەوە لێ بدەین کە چارەسەری ئامادەشمان لەبەردەستە، هەروەك چۆن زۆر لە پارێزەرانی مافە سروشتییەکان پێیانوایە. لە چاو سیستمە قانوونییەکانی چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی، قانوونی نێودەوڵەتی بە قۆناغێکی پێگەیشتنی سەرەتایی گەیشتووە، بەڵام هەوڵی ئەوەش دەدات، لەرێگەی چەندین شێوازی ئاشتیانەی پلەبەپلەوە، چارەسەر بۆ ئەو ئاریشانە بدۆزێتەوە، لەو شێوازانە گەشەپێدانی ئەو قانوونانەی کە هەن، بۆ نموونە ((ئەو قانوونە کلاسیکیانەی کە بۆ ئازادی هاتووچۆی دەریایی تەرخانن، لەگەڵ ئەگەری ئەنجامدانی دەستکارییکردنیان بە جۆرێك فەزای دەرەوەش بگرنەوە))، هەروەها دارشتنی قانوونی نوێ لە رێگەی رێککەوتننامەو پەیماننامەی نێودەوڵەتییەوە، ئەوانەی زۆربەی گەلانی شارستانی - ئەگەر هەموویشیان نەبن — پێگیری دەبن هەروەها دامودەزگای نوێی نێودەوڵەتی پێکبهێنرێت لە چەشنی نەتەوە یەکگرتووەکان و دادگای دادی نێودەوڵەتی، ئەم قانوون و بڕیارانە هەرچەندە خراپ گەشەیان کردووە، لە رووی مێژوویەوە قەرزارباری ئەو بیروباوەڕەن کە پێیوابوو قانوونی سروشتی عەقڵانی و گەردوونییە، لەگەڵ ئەوەشدا گرانە ببینین ئایا چۆن بەپشتبەستن بە سیستمێکی تەمومژاوی، دەشێین ئەو ئاریشانە چارەسەربکەین کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییان نیگەران کردووە، ئەو سیستمە تەمومژاوییەی سیستمێکی باڵای بۆ داد لە خۆگرتووە کە ناکرێت فەرمانە کردەنییەکانی دەستنیشان بکەین و هیچ دەسەڵاتێکی مرۆڤایەتیش ناتوانێت



بەشێوەیەکی فەرمی راڤەشی بکات، بۆ نموونە چۆن دەتوانین لەوە دڵنیا بین کە قانوونی سروشتکرد بە پێویستی دەزانێت بۆشایی ئاسمانی ئازاد بێت؟ ئەم پرەنسیپە نە مانای هەیەو نە بەهاشی هەیە بەبێ ئەوەی نووسراوەیەکی قانوونیی فراوان بوونی نەبێت، ئاسانیش نییە بڵێین ئەو نووسراوەیە بە هۆی بڕیارو فەرمانەکانی قانوونی سروشتییەوە خولقاوە، هەروەها هزری قەبوولکردنی پرەنسیپێکی لەو جۆرەش ناکرێت ئەگەر وڵاتە مەزنەکان رازی نەبن و نەگەنە ئەو قەناعەتەی کە ئەو پرەنسیپە لە خزمەتی بەرژەوەندییە نەتەوایەتییەکانی ئەواندایە، هەرلەبەرئەوە لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوایەتی و نێودەوڵەتی، رۆڵی قانوونی سروشتکرد هەر بە تەمومژاوی و نائاشکرا دەمێنێتەوە.

رەنگ بێ دوایین ئەزموون بۆ سەرکەوتنی قانوونی سروشتکرد وەك ئامرازێکی چارەسەرکردنی گرژیو بشێوی نێوان قانوون و ئەخلاق لەو بوارانەدا بێ کە بەشێکی کۆمەڵگە بەسەر بەشێکی تریداو بۆ جێبەجێکردنی جۆرە ئایدۆلۆجیایەك، سیستمێکی تیرۆریستیی داپڵۆسێنەرانە دەسەپێنێت، لە چاخی نوێداو لەگەڵ دەرکەوتنی ئەڵمانیای نازیدا هەندێك باری وا دەرکەوتوون کە زۆرینەیەکی چەوساوە هەوڵی داوە کەمینەیەکی دیارو شایستەو بەجیاهەڵکەوتووی دانیشتوان تێکبشکێنێت، لە باشووری ئەفریکاش دەبینین کەمینەیەکی سپیپێست تەواوی سەنتەرەکانی سەرکردایەتیکردنی ئابووری و سەربازی و سیاسی و کۆمەڵایەتی خستووەتە ژێر دەست و، قانوونی وڵاتەکەش وا ئاراستە دەکەن کە بتوانن باڵادەستبوونی کەمینەی سپیپێست بەسەر زۆرینە رەشپێستەکەدا بهێڵنەوە ئەوەش لەژێر چەتری ئامانجێکی راگەیەنراودا کە بریتییە لە پاراستنی شارستانێتی سپیپێستەکان[٢]. لە بەرانبەر ئەو جۆرە بارودۆخانەدا زۆرجاران چەندوچوون لەسەر ئەوەیە کە بەتەنێ قانوونی سروشتکرد دەکارێت چارەسەر بۆ ئەو جۆرە تەنگژە قانوونییانە بدۆزێتەوە، لێ بەرلەوەی لەو بارە هەستیارە بکۆڵینەوە پێویستە گۆشەنیگای مەزهەبی پۆزەتیڤیزم بۆ خوێنەران روون بکەینەوە.

٢- لە دوای ١٩٩٠-ەکان ئەم رەوشە وەکو خۆی نەماو ئاشتەوایی نیشتمانی ئەنجامدراو وڵاتەکە پرۆسەیەکی سیاسی دیموکراتی دەست پێکرد و لە یەکەمین هەڵبژاردندا، رەشپێستەکان بردیانەوەو نیلسۆن ماندێلا بووە سەرکۆمار "بلاوکەرەوە".